# جوگرافیا

## بۆ پۆلی شەشەمی ( دوازدەهەمی ) وێژەیی

## (٢٠١٦ ـ ٢٠١٧)

ئامادەکردنی مامۆستا

ئاکۆ صابر عثمان/ هەولێر

# بەشی یەکەم/ پیشەکیەکی جوگرافیای ئابووری

**جوگرافیای مرۆڤ** :بایەخ بەو لێکۆڵینەوانە دەدات کە بە مرۆڤ و چالاکیەکانەوە بەندە ، لەم دیاردانـەش وەکـو دانیشـتوان و کشـتوکاڵ و نیشتەجێ بوون .

**جوگرافیای ئابووری**:یەکێکە لە بوارەکانی جوگرافیای مرۆڤ کە تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی ئەو دیاردانەی بـە چـالاکی ئـابووری مرۆڤـەوە بەندن ، لە سەرەتاوە قۆناغی شمەك بەرهەم هێنان تـا دەگاتە ئاڵوگۆڕی شمەکەکە و تەنانەت بەکاربردنیشی .

**هۆ/ خاسیەتی جوگرافیای ئابووری ئەوەیە کە لە ئاوەرۆکەوە زوو زوو دەگۆڕێت ؟**

چونکە لە ڕووی بۆچوونی جوگرافیەوە چارەسەری بابەتی ئەوتۆ دەکـات کـە لـە گـۆڕانێکی بـەردەوام دان وەك کشـتوکاڵ و پیشـەسـازی و گواستنەوە و بازرگانی .

**بۆشایی**/ لەخاوەنی ئەو بیردۆزانەی کەباس لە بنچینەی شوێنە ئابووریەکان دەکات لە جوگرافیای پیشەسازی وەك : **ئەلفرێد ڤیبر و ئۆگۆست لۆش**.

**پیشە** :لە پیشەگەریەوە هاتووە کە ڕێکخستنێکە پێکهاتنە هونەریەکانی بەرهەمهێنانی تێدا لەیەك دەچـێت،وەك ئـەو هـۆ و ئامێرانـەی تێیدا بەکار هاتوون و ئاما نجی ئەوەیە کە کەلوپەل وکارگوزاری دیاری کراو بەرهەم بێنێت کە سەرچاوەی داهات پێکدەهێنن .

**پیشەی ئابووری مرۆڤ**

- **پیشەی ئابووری بژێوی**
  - **پیشەی بژێوی سەرەتایی**
    - کۆکردنەوەی سەرەتایی
    - شوانکارەی سەرەتایی
    - کشتوکاڵی سەرەتایی
  - **پیشەی کشتوکاڵی بژێوی چڕ**
- **پیشەی ئابووری بازرگانی**
  - پیشەی ڕاوەکێوی و ڕاوەماسی
  - پیشەی داربڕین لە جەنگەڵەکان
  - پیشەی کشتوکاڵی بازرگانی
  - پیشەی کانزاکاری
  - پیشەسازی
  - پیشەی بازرگانی و گواستنەوە

**هۆ/ ناوچەکانی کۆکردنەوەی سەرەتایی بە ئاسایی دەکەونە ناوچە زۆر کەنارگیرەکانەوە ؟**

و/ چونکە دانیشتوانی ئەم ناوچانە لە تەوژمی شارستانێتی جیهان پچڕاون و هەر لە ئاستی شارسـتانێتی سـەرەتاییدا ماونەتـەوە ،و بـۆ وەدەست هێنانی پێداویستیە سادەکانیشیان لە خۆراك و پۆشاك و ئامرازی ڕۆژانەیان پشت بە سروشت دەبەستن .

**بۆشایی**/ کەمی سەرچاوەی بژێوی (کەمی داهات ) لە پیشەی کۆکردنەوەی سەرەتایی بۆتە هۆی **کەمی چڕی دانیشتوان**.

**هۆ/ کەمی چڕیی دانیشتوان لە ناوچەکانی کۆکردنەوەی سەرەتایی ؟**

و/ چونکە سروشت لەم ناوچانەدا کەم توانایە و ئەم جۆرە ئاستەی بەرهەم هێنانـەش ناتوانێـت ژمارەیـەکی زۆری دانیشـتوان بژێـەنێت ، تەنانەت ئەم چڕیە لە زۆر شوێندا دەبێ بە یەك تاکە کەس بۆ ٢٢٠ کم٢ .

**دابەش بوونی جوگرافی پیشەی کۆکردنەوەی سەرەتایی :-**

پیشەی کۆکردنەوەی سەرەتایی لە ناوچە خولگەییەکان وژوورووەکاندا وەك یەك هەیە و لە چوارچێوەیەکی تەسکدا نـەبێت لـە بازنـەکانی ناوەند دا دەرناکەوێت.بەم شێوەیە :

**١- لە ناوچە خولگەییەکان :**

أ – حەوزی ئەمەزۆن ( لە بەرازیل و نیکوادۆر و ڤەنزوێلا ) کە هیندیە سوورەکانی لێ دەژی .

ب- حەوزی کۆنگۆ لە زائیر ( کۆنگۆی دیموکراتی ) کە کورتە باڵاکانی لێ دەژی .

ج- مالیزیا کە مالیزیەکانی لێ دەژی و باشووری تایلەند کە ( سیمانك )ەکانی لێ دەژی .

٢- لە بازنەکانی ژوورو:

أ - باکووری کەنەدا .
ب- باکووری ئۆراسیا

کۆمەڵەی ئەسکیمۆ لەم دووناوچانەدا دەژین .

٣- لە بازنەکانی ناوەند ( ناوەڕاست ):

أ - بیابانی کەلەهاری لە باشووری خۆرئاوای ئەفریقیا کە ( بۆشمەن )ەکانی لێ دەژی .

ب- ناوەڕاستی ئوستورالیا کە دانیشتوە ڕەسەنەکانی ئوستورالیای لێ دەژی .

**سیمانگ** :ئەومرۆڤانەن لە ناوچەیەکسانەکانی باشووری تایلەند بە بەرووبوومی ڕووەك دەژین وەك میوە وگەڵا لەگەڵ ڕاوی گیانەوەران .

**ئەسکیمۆ**: ئەو کۆمەڵە مرۆڤانەن کەلە بازنەکانی ژوورو لەباکوری کەنەدا وباکوری ئۆراسیا بەڕاوکردنی گیانەوەری کێوی دەریایی و وشکایی دەژین،کە پلەی گەرمی نزم دەبێتەوە تا ئەو ڕادەدەیەی وەرزی بەستن زۆربەی ڕۆژانی ساڵ دەگرێتەوە.

**بۆشمەن**:ئەو کۆمەڵە مرۆڤانەن کەلە بیابانی کەلەهاری لەباشووری خۆرئاوای ئەفریقیا لەسەرپیشەی کۆکردنەوەی سەرەتایی دەژین .

**هۆ/ ئەگەرپیشەی شوانکارەی سەرەتایی لەگەڵ پیشەی کۆکردنەوەی سەرەتایی بەراورد بکرێت بە قۆناغێکی پێشکەوتووتر دادەنرێت ؟**

و/ چونکە مرۆڤ بۆ یەکەم جار توانیویەتی پێداویستیەکانی خۆی لە ڕێگەی بەخێوکردنی ئاژەڵەوە بەرهەم بهێنێ .

**دابەش بوونی جوگرافی پیشەی شوانکارەی سەرەتایی:**

لە کەنارەکانی زەریای ئەتلەسی لە ئەفریقیا درێژ دەبێتەوە تا ناوەڕاستی ئاسیا لە مەودایەك کە لە ١٠ هەزار کم پترە ، لە نێوان بازنەی پانی ( ٥° ) پلە لە باشوور و ( ٥٠° ) پلە لە باکوور .

**بۆشایی**: ئەو ناوچانەی گژوگیایان زۆرە وەك دەوروپشتی بیابانەکان کە پێیان دەوترێت ستێپس **مەڕومالآت** یان لێ دەلەوەڕێت.

**بۆشایی**: ئەو ناوچانەی ڕووەکی سروشتیان زۆرە وەك گیای سافانا **ڕەشەوڵاغ** یان تێدابەخێودەکرێت.

**تەندرا** : ناوچەیەکە لە باکووری ئۆراسیا کە وەرزی گەشەسەندنی کورتە و جگە لە هەندێ کورتەگیا هیچی تری لێ ناڕوێت کە ئەویش لەوەڕگەی ئاسکی ( ڕەنە )یە .

**لاما** :ئەو ئاژەڵەیە کەهیندیەسوورەکان لەچیاکانی ئەندیز لە ئەمریکای باشور بەخێوی دەکەن.

**ئەلیاك**:ئەو ئاژەڵەیە کەلە بەرزاییەکانی ئاسیای ناوەڕاستدا بەخێودەکرێت.

**هۆ/ کۆچ و ڕەوی شوانکارەکان لە هەرێمی کوردستان و چیاکانی ئەتلەسی مەغریب ، ستوونیە ؟**

چونکە لە هاوین لەگەڵ مەڕ ومالآتەکانیان ڕووەو بەرزایی چیاکان دەچن بۆ لەوەڕی ئەو مێرگانەی بە هاوین ئەم ناوچانەی دا پۆشیوە ، بەلآم لە سەرەتای پاییز کاتێك پلەی گەرمی لەسەر چیاکان نزم دەبێتەوە ، ئەوانیش بۆ ناوچە نزمەکان دادەبەزن .

**هۆ/ کۆچ و ڕەوی شوانکارەکان لە بیابانی گەورەی ئەفریقیا دا، ئاسۆییە ؟**

چونکە لە کاتی باران وگیا پەیدا بوونی زستانەدا بەرەو ناوچەی باکوور دەچن ، بەلآم لە هاویندا بەرەو ناوچەی باشوور دادەبەزن کە گیای لێ سەوز دەبێت لە کاتێکدا لەم وەرزەدا لە بەشەکانی باکووردا وشك دەبێت ،بۆیە جیاوازی شوێن دەبێتە هۆی جیاوازی ڕادەی باران بارین و وەرزی بارانەکەی،ئەمەش دەبێتە هۆی **کۆچ وڕەوی ئاسۆیی شوانکارەکان**.

**هۆ/نزمی پلەی گەرما کاردەکاتە سەرکۆچ وڕەوی ئاسۆیی لەبازنەکانی ژووروودا کە شوانکارەکانی ڕەنەبەرەوبازنەی ناوەڕاست دەکشێن ؟**

چونکە زستانان پلەی گەرمی لە بازنەکانی ژووروودا نزمە ، هاوینانیش بەرەو جەمسەری باکور دەڕۆن کاتێك بەفر دەتوێتەوە و هەندێ گیا دەڕوێت کە ئاسکی ( ڕەنە )ی لەسەر دەلەوەڕێت وەك لە باکووری ئۆراسیا .

**هۆ/ پیشەی کشتوکاڵی سەرەتایی لەچاوپیشەی کۆکردنەوەی سەرەتایی وشوانکارەی سەرەتایی بەپیشەیەکی پێشکەوتووتر دادەنرێت ؟**

**چونکە** ① لەلایەکەوە مرۆڤی وا لێکرد کە بتوانێت بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانی ژیانی خۆی،سەرچاوەکانی سامانی سروشتی وەبەربهێنێ .

② لەلایەکی تریشەوە یارمەتی مرۆڤی دا بۆ نیشتەجێ بوون لە شوێنێکدا لە جیاتی کۆچ و ڕەو بۆ مەودایەکی دوور و درێژ .

**هۆ/ پیشەی کشتوکاڵی سەرەتایی لەگەڵ پیشە بژێوییە سەرەتاییەکانی تر جیاوازە ؟**

چونکە دەکەوێتە ئەو بازنە خولگەییانەی کە بارانیان زۆر لێ دەبارێت .

**دابەش بوونی جوگرافی پیشەی کشتوکاڵی سەرەتایی :**

١- حەوزی ئەمەزۆن ( ئەمریکای باشوور ) و لەوێشەوە بەرەو ناوچەکانی ناوەوەی ( ئەمریکای ناوەڕاست ) درێژ دەبێتەوە .

٢- حەوزی کۆنگۆ لە زائیر ( کۆنگۆی دیموکراتی ) لەگەڵ دوورگەی مالاگاشی ( ئەفریقیا ) .

٣- دوورگەکانی ئەندەنوسیا و فلیپین ومالیزیا وڤێتنام ( باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا ) .

**هۆ/ خاکی ناوچە خولگەییەکان خۆراکی کەمە ؟**

چونکە بارانیان زۆرلێ دەبارێ وئەمەش دەبێتە هۆی توانەوەی ماددە خۆراکیەکان وگوێزانەوەیان لەگەڵ بارانەکە بۆ ناخی زەوی، ئەم کردارەش پێی دەگوترێت داشتن .

**داشتن** :ئەم کردارە لە ناوچە خولگەییەکان ڕوودەدات چونکە بارانیان زۆر لێ دەبارێ و ئەمەش دەبێتە هۆی توانەوەی ماددە خۆراکیەکان و گوێزانەوەیان لەگەڵ بارانەکە بۆ ناخی زەوی .

**هۆ/ کرداری داشتن هەمیشە کۆسپە لە ڕێی کشتوکاڵدا لە ناوچە خولگەییەکاندا ؟**

چونکە ئەگەر سێ ساڵ زەویەکە داچاندرا بەرهەمەکەی بە ڕادەیەك کەم دەکات کە جوتیارەکان ناچار دەکات ئەوە زەویە بەجێ بهێڵن و بچن بۆ پارچە زەویەکی تر .

**هۆ/ بە کشتوکاڵی سەرەتایی دەڵێن کشتوکاڵی جێ گۆڕ ؟**

چونکە جوتیارەکان بەهۆی کرداری داشتن ناچار دەبن زەویەکانیان جێ بهێڵن و بچن بۆ پارچە زەویەکی تر ، کە هەندێ جار گوندەکانیشیان دەگوازنەوە لەگەڵ خۆیاندا بۆ زەویە نوێیەکان ، هەندێ جاریش لە گوندەکانی خۆیان دەمێننەوە ئەگەر شوێنی زەویە نوێیەکان دوور نەبێت .

**دابەش بوونی جوگرافی پیشەی کشتوکاڵی بژێوی چڕ :**

باشور وباشوری خۆرهەڵاتی ئاسیا لەنێوان بازنەی پانی(١٠- ٥٠ )ی باکور،کەبەزۆری ئەم وڵاتانە دەگرێتەوە:چین و هیندستان وبەنگلادیش و ڤێتنام وتایلەند و ئەندەنوسیا، لەم پیشەیەدا بەرهەمهێنان بریتیە لە بایەخدان بەخۆراك پەیداکردن بۆ ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوان کەلە نیوەی دانیشتوانی جیهان زۆرترن.

**مەرەزە کردن لە تەلان** :- بریتیە لە مەرەزە کردن لەو بەرزاییانەی کە ڕادەی باران بارینیان بەشی مەرەزە کردن دەکات و کردوویانە بە تەلان تا بەرزایی ( ٦٠٠ م ) ، وەك لە ژاپۆن و فیلیپین و ئەندەنوسیا .

**هۆ/ بەرهەمداری تاکەکەس لە ( پیشەی کشتوکاڵی بژێوی چڕ ) کەم دەبێتەوە ؟**

بەهۆی چڕی دانیشتوان بەتایبەتی لە باشوور و باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا کە چڕی جوتیاران لەسەر پارچە زەویەکی کشتوکاڵیدا سێ ئەوەندەی چڕیی دانیشتوانی سەر پارچە زەویەکی تری وەك ئەوە .

**خاسیەتەکانی پیشەی ئابووری بازرگانی**

١- بەرهەم لە پێداویستی بەرهەم هێنەکان زۆرترە .

٢- بەرهەم هێنان شارەزایی و پسپۆڕی ( تایبەتمەندێتی ) و کاردابەش کردنی لە گەڵدایە .

٣- زۆریی هەندێك بەرهەم و کەمیی هەندێکی تری دەبێتە هۆی ئاڵوگۆڕی ئەو بەرهەمانە ،واتە ناردنەدەرەوەی زیادەکە وهێنانی کەمەکە، ودروست بوونی بازرگانی .

٤- بەرهەم هێنان لەم پیشەیەدا کارگوزاریشی لەگەڵدایە بۆ دابین کردنی پێداویستی هەمەجۆرەی خەڵکی وەك پزیشکی وفێرکردن .

| پیشەی ئابووری بژێوی | پیشەی ئابووری بازرگانی |
|---|---|
| أ- توانای مرۆڤ هەرنەوەندەیە کەبتوانێ پێداویستیەکانی خۆی وخێزانەکەی لەخۆراك وپۆشاك وکەلوپەلی کارەکەی بەرهەم بهێنێ. | أ- بەرهەم لە پێداویستی بەرهەم هێنەکان زۆرترە. |
| ب- بەرهەم تەنها بۆ بژێوی یە. | ب- زۆریی هەندێك بەرهەم و کەمیی هەندێکی تری دەبێتە هۆی ئالوگۆڕی ئەو بەرهەمانە، واتە ناردنەدەرەوەی زیادەکە وهێنانی کەمەکە، ودروست بوونی بازرگانی . |
| ج- کاردابەش کردن لەسنوورێکی کەمدایە، وهەریەکە لە ئەندامانی خێزانەکە هەوڵ دەدات زۆربەی کارەکان بکات . | ج- بەرهەم هێنان شارەزایی و پسپۆڕی ( تایبە تمەندێتی ) و کاردابەش کردنی لە گەڵدایە . |
| د- بەرهەم هێنان لەم پیشەیەدا کارگوزاری لەگەڵدا نیە . | د- بەرهەم هێنان لەم پیشەیەدا کارگوزاریشی لەگەڵدایە بۆ دابین کردنی پێداویستی هەمەجۆرەی خەڵکی وەك پزیشکی و فێرکردن. |
| ه- سەرمایە کەمە و ڕێکخەری سەرەکی کارە ، وتەکنیك لەسەر بنەڕەتێکە کە بە ئامێر ومەکینە نیە . | ه- سەرمایەکی زۆر وشێوازی زانستی وئامێرومەکینەی پێشکەوتووی تیادا بەکاردەهێنرێ. |

**بۆشایی /** لەگەڵ زۆربوونی دانیشتواندا ناوچەکانی ڕاوی وشکانی گۆڕا بە **لەوەڕگا** .

**بۆشایی /** دەشتەمەزنەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە پیشەی ڕاوی **گامێشی کێوی** کران بە لەوەڕگای مەڕومالات و ڕەشەوڵاغ.

**بۆشایی /** ڕادەی بەرهەمی دەریا لەجیهاندا لەبەرهەمهێنانی ماسی دەگاتە **٦/٥** .

**بۆشایی /** ڕادەی بەهەمی ڕوبار ودەریاناوخۆییەکان لەجیهاندا لەبەرهەمهێنانی ماسی کەمترە لە **٦/١** .

**شۆستە قارەکان ( تەنکاوەکانی کەنارە کیشوەرەکان ):** بریتین لە شوێنە تەنکاوەکانی زەریاکان کە گرنگترین شوێنی ڕاوە ماسین لەجیهان چونکە لەو ناوچانەدا ماددەی خۆراکی زیندەوەری و ڕووەکی هەیە بۆ ماسیەکان ، گرنگترینیان **هەڵواسراوەکان** کە زیندەوەری وورد و میکرۆسکۆپین کە بە ژمارەی زۆر دەکەونە سەر ئاو و لە ملیۆن تێدەپەڕن لە پێیەکدا و لەگەڵ تەوژمی ئاوەکە دەجوولێن ، هەروەها لەو ناوچانەدا تیشکی خۆر تا قووڵایی ( ٦٠ م ) دەچێتە خوارەوە کە ئەمەش ڕێگا بە پەیدا بوونی ژیان دەدات .

**دابەش بوونی جوگرافی ناوچەکانی ڕاوە ماسی لە جیهاندا :**

١- باکوری خۆرئاوای زەریای هێمن لە نیمچەدوورگەی کەمەشتکا تا کەنارەکانی باشوری چین .

٢- باکوری خۆرهەڵاتی زەریای ئەتڵەسی کەلە زەریای بەستەڵەکی باکور تاکو ئیسپانیا ولەئایسلەندە تاکو نەرویج درێژدەبێتەوە .

**هۆ/ کەمی شوێنی ڕاوە ماسی لە کەنارەکانی ئەمریکای باشوور و ئوستراڵیا و ئەفریقیا ؟**

بەهۆی تەسکی کەنارە کیشوەرەکانیان ( تەسکی شۆستەی قارەکانیان ) .

**هۆ / دەوڵەتان لەنێوخۆیاندا بۆ ڕێکخستنی ڕاوەماسی ڕێککەوتن و پەیمانیان بەستووە ؟**

**بەهۆی ئەو کۆسپانەی دێنە ڕێی ڕاوە ماسی کە ئەمانەن :**

١- کۆسپی سروشتی وەك گەرداووتەمومژو پارچە سەهۆڵی گەورە، وەك لەباکوری خۆرئاوای زەریای ئەتڵەسی نزیك گرینلاند لەوەرزی بەهار.

٢- کۆسپی مرۆیی وەك تێپەڕبوونی هێڵی هاتوچۆ کردن بەناو ئەو زەریایانەی کە ڕاوە ماسیان تێدا دەکرێت ، و زۆر ڕاو کردنی ماسیش دەبێتە هۆی قڕکردنی هەندێ جۆری ماسی وەك هەندێ جۆری ئەهەنگ .

**بۆشایی :**

١- ژمارەی کارگەرانی پیشەی ڕاوە ماسی لە **ئایسلەندە** دەگاتە پێنجیەکی دانیشتوانی .

٢- بەرزترین تێکڕای بەکاربردنی ماسی لەلایەن تاکە کەسیکەوە لە جیهاندا لە وڵاتی **ژاپۆن** دایە .

٣- ماسی بڕبڕەی پشتی ناردنی وڵاتی **ئایسلەندە** یە ، و لە ناردنیەکانی هەردوو وڵاتی **نەرویج** و **پەنەما** شدا بایەخێکی زۆری هەیە .

٤- گرنگترین دەوڵەتەکانی ڕاوە ماسی لە جیهاندا بریتین لە **چین** و **پیرۆ** و **شیلی** و **ژاپۆن** .

| جەنگەڵە خولگەییەکان<br>( نیوە ) | جەنگەڵە مام ناوەندیە نیمچە گەرمەکان( خەزانیەکان )<br>شەش یەک | جەنگەڵەمام ناوەندیەساردەکان ( سنەوبەریەکان )<br>سێ یەک |
| --- | --- | --- |
| ١- گرنگترین درەختەکانی<br>ماهۆکنی ، ئەبەنوس ڕەش ، ساج ، نورزی یەکسانی .<br>٢- دابەش بوونی جوگرافی :-<br>ماهۆکنی لە هایتی و دۆمنیکان( ئەمریکای ناوەڕاست ) و لە کەناری غینیا ( ئەفریقیا ).<br>ئەبەنوس ڕەش لە ناوەڕاستی ئەفریقیا و مالاگاشی و لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا .<br>ساج لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا .<br>نورزی یەکسانی لە ئەمریکای ناوەڕاست و لە بەرازیل .<br>هەروەها لە باشوری سودانیشدا دەردەکەوێ.<br>٣- فرە چەشنی جۆری دار و درەختەکانی .<br>٤- لەبەر ئەوەی زۆربەیان ڕەقن و سەر ئاو ناکەون بۆیە گواستنەوەیان کۆسپی دێتە ڕێ .<br>٥- کۆکردنەوەی بەرهەمی ئەم جەنگەڵانە بە مەبەستی پیشەسازی لە هەردوو جەنگەڵی خەزانیەکان و سنەوبەریەکان زیاترە ، بۆ نموونە ڕیواڵی لاستیکی سروشتی و ڕیواڵی داردەبەن لە ئەمریکای لاتینی کۆدەکرێتەوە ، ڕیشاڵ لە درەختی ئەلاباکا ( کنەری مانیلا ) لە فلیپین کۆدەکرێتەوە . | ١- گرنگترین درەختەکانی :-<br>زان ، ئەسپیندار ، قەستەڵ ، گوێزی ئەمریکی بەتولا<br>٢- دابەش بوونی جوگرافی :-<br>خۆرهەڵات و باکووری خۆرهەڵاتی وڵاتە یەکگرتووەکان<br>خۆرئاوای ئەوروپا تا چیاکانی ئۆراڵ .<br>بەشەکانی ناوەوەی سیبیریا و چین و کۆریا و ژاپۆن .<br>باشووری بەرازیل و ئەرجەنتین و شیلی.<br>باشووری خۆرهەڵاتی ئوسترالیا .<br>بەشێکی کەمی خۆرهەڵاتی یەکێتی باشووری ئەفریقیا<br>٣- کەمیی چڕی جۆری دار و درەختەکانی .<br>٤- بە ئاسانی دەگوازرێنەوە .<br>٥- درەختی جەنگەڵە مامناوەندیە نیمچەگەرمەکان لە ڕووی بازرگانی نێوان وڵاتانەوە گرنگیەکی زۆری هەیە ؟<br>چونکە دار و درەختەکانی بۆ زۆر مەبەست بەکاردێن وەك خانوو دروست کردن یان پاڵپشت بۆ هێڵی قەتار یان دروست کردنی کەلوپەلی ناوماڵ . | ١- گرنگترین درەختەکانی :-<br>سنەوبەر ، شەربین ، سەروو ، نورز .<br>٢- دابەش بوونی جوگرافی :<br>ئۆراسیا : ئەسکەندەنافیا لە ئەوروپا و ، سیبیریا لە ئاسیا .<br>ئەمریکای باکوور : لە ئالاسکا تا لیبرادۆر درێژ دەبێتەوە .<br>خۆرئاوای مەکسیك و خۆرئاوای وڵاتە یەکگرتووەکان .<br>٣- چڕیەکەی کەمترە لە جەنگەڵە خەزانیەکان .<br>٤- بە ئاسانی بە ڕووبار یان بەهۆی هەڵکەندنی جۆگە دەگوازرێتەوە .<br>٥- لەناو ئەم جەنگەڵانەدا مەڵبەندی لێ دامەزراوە بۆ کۆکردنەوەی تەختە و شت لێ دروست کردنی ، هەندێ جار لە شێوەی هەویرەی کاغەز و کاغەزی چاپەمەنی و هەندێ ڕۆنیشی لێ دەگیرێت کە بۆ چەور کردنی کەشتی بەکاردێت |

**هۆ / ڕووبەرێکی فراوانی درەختەکانی جەنگەڵە مام ناوەندیە نیمچە گەرمەکان ( خەزانیەکان ) دەست کرا بە بڕینیان ؟**

چونکە ئەو ناوچانە بۆ ژیان و چالاکی مرۆڤ لەبارن ، بەتایبەتی بۆ کشتوکاڵ کە شوێنی ئەو جەنگەڵانەی گرتەوە لەو ناوچانەی کە درەختەکانی لێ بڕاون .

**ماهۆگنی** :یەکێکە لە درەختەکانی جەنگەڵە خولگەییەکان کەلە هایتی ودۆمنیکان( ئەمریکای ناوەڕاست ) و لە کەناری غینیا ئەفریقیا ) دا هەیە

**ئورزی یەکسانی** : یەکێکە لە درەختەکانی جەنگەڵە خولگەییەکان کە لە ئەمریکای ناوەڕاست و بەرازیل دا هەیە ، جیاوازیشی لەگەڵ درەختەکانی تری جەنگەڵە خولگەییەکان ئەوەیە کە تەختەکەی نەرمە .

**بۆشایی/** جەنگەڵە مامناوەندیە ساردەکان لەگەڵ جەنگەڵە مامناوەندیە نیمچەگەرمەکان لەیەکدەچن لەڕووی کەمی جۆری درەختەکان.

**هۆ/ وەبەرهێنانی دار و تەختە لە جەنگەڵە خولگەییەکان لە ڕووی ئابووریەوە چەند کۆسپێکی دێتە پێش ؟**

١- فرە چەشنی جۆری دار و درەختەکانی کە دەگاتە ١٠٠ چەشن لە دۆنمێکدا ،ئەگەر بمانەوێ درەختی ( ماهۆگنی ) مان دەست بکەوێ ڕەنگە لە ڕووبەری دۆنمێکدا تاقە یەك درەختمان دەست بکەوێت.

٢- بوونی ڕووەکە هەڵچووەکان کەدرەختەکان تێکدەئاڵێنێ و لە کاتی بڕینیشدا لەگەڵ درەختەکانی تردا لێك نابنەوە و درەختە بڕاوەکە هەر بەسەر دارەکانی تردا دەمێنێتەوە.

٣- درەختەکانی ڕەقن و زۆربەیان سەرئاو ناکەون بۆیە گواستنەوەیان کۆسپی دێتە ڕێ و گرانە .

**ئەلاباکا** :یەکێکە لە درەختەکانی جەنگەڵە خولگەییەکان و پێی دەڵێن ( کندری مانێلا ) لە فلیپین و ڕیشالی لێ کۆدەکرێتەوە .

**هۆ/ ڕێژەی کارگەرانی پیشەی کشتوکاڵی بازرگانی لە سەرجەمی کارگەرانی چالاکیە هەمە جۆرەکانی تر کەمترە ؟**

بەهۆی بەکارهێنانی زانیاری و تەکنەلۆژیا بۆ زیادکردنی بەرهەمداریی تاکە کەسێك .

**بۆشایی /** ڕێژەی کارگەران لەکشتوکاڵدا لە هیندستان دەگاتە دووسێیەك و لە نیجەر دەگاتە ٨٩.٤ ٪ ی سەرجەمی کارگەران.

**بۆشایی/** بۆئەوەی بەکێڵگەیەکی بازرگانی دابنرێت پێویستە نیوەی بەرهەمەکەی بۆ فرۆشتن بێت.

**کێڵگە بازرگانیەکان دوو خاسیەتی بنەڕەتیان هەیە :**

١- پەیدا کردنی بەروبوومی خۆراك کە پێویستیەکی مرۆڤە ، وەك گەنم و برنج و گە نمەشامی و جۆ .

٢- بەرهەم هێنانی کەرەستەی خاوی پیشەسازی وەك لۆکە ( پەمۆ ) و کەتان و قامیشی شەکر .

**کشتوکاڵی بازرگانی بە دوو ڕێگە فراوان دەکرێت :**

١- فراوان کردنی ئاسۆیی : مەبەست لەمە خۆش کردنی زەوی و ووشك کردنی زەلکاوەکان و داچاندنی زەویەکانە .

٢- فراوان کردنی ستوونی:مەبەست لەمە زۆرکردنی توانای بەرهەم هێنانی زەویە کشتوکاڵیەکانە بە پەیداکردنی هەندێك جۆرە بەرووبوومی دیاریکراو،وچاك کردنی خاسیەتی خاکەکە وبەرزکردنەوەی توانای بەرهەم هێنانی،ئەمە جگە ئەوەی کە دەبێ ماوەماوە پەیینی پێوەبکرێت.

**دابەش بوونی جوگرافی پیشەی کشتوکاڵی بازرگانی،بەشێوەیەکی سەرەکی لەبەشە شێدارەکانی بازنەکانی ناوەڕاستدا کۆدەبێتەوە وەك:**

١- خۆرئاوای ئەوروپا و درێژ بۆتەوە بۆ خۆرئاوای ئاسیا .

٢- خۆرهەڵاتی ولاتە یەکگرتووەکان و کەنەدا .

**کانزاکاریی** :ئەو چالاکیانەیە کە پەیوەندیان بە دەرهێنانی کانزا و شتی تردەوە هەیە لە ناخی زەوی ، جا ئەمە بە شێوەی ڕەقی بێت یان شلی ، و بە بیر هەڵکەندن یا تونێل یا بە دەرکێشان بێت .

**بۆشایی/** هیچ پەیوەندیەکی ئاشکرا نییە لە نێوان کانزاکاری و چڕی دانیشتوان.

**بۆشایی /** کانزاکاری لەهەموو کیشوەرەکاندا هەیە بەلام ڕووبەرەکانی بەزۆری کەمن بەڕادەیەك ناتوانرێت بەشێوەی خاڵ نەبێت لەسەرنەخشەدا دیاری بکرێت.

**هۆ/ بەرهەم هێنانی کانزا بە زۆریی لە ناوچەیەکی دیاری کراودایە ؟**

**چونکە یەدەگی کانزا لە ناوچەیەکی تەسکدایە .**

**وەتەرساند : ناوچەیەکی دیاریکراوی بەرهەم هێنانی زێڕە لە باشووری ئەفریقیا کە رێژەیەکی زۆری زێڕی جیهان بەرهەم دەهێنێ .**

**هۆ/ وا پێویست دەکات کە لە پیشەی کانزاکاریدا ، نیشتگەی بچووکی وەك گوندی راوکەران پەیدا ببێت( دروست بکرێت )؟**

**١- لەبەر کەمیی کارگەران لە پیشەی کانزاکاریدا .**

**٢- لەبەر ئەوەی ئەو پیشەیە بە زۆری دەکەوێتە شوێنەکانی دووره شارەوە .**

**٣- تاکو کارگەرەکانی تێدا نیشتەجێ بن کە بە رۆژ جێی دەهێڵن و بە شەویش دوای تەواوبوونی کاری رۆژانەیان دەگەرێنەوە ناوی .**

**پیشەسازی : بریتیە لەو کردارەی کە مادده خاوەکان دەگۆرێت بۆ شمەکی دروستکراو.**

**سروشتی ئەو پێوانانەی کە لە دیاریکردنی کۆمەڵگای پیشەسازیدا بەکاردێن بریتین لە :**

**١- ناوەندی تێکرای داهاتی تاکەکەس لە داهاتی نەتەوایەتی .**

**٢- پلەی بڵاوبوونەوەی خوێندەواری بە قۆناغە جیاوازەکانیەوە .**

**٣- رادەی بڵاوبوونەوەی شارەکان لە رێی زانینی قەبارەیان .**

**٤- رێژەی کارگەران لە پیشەسازیدا زیاترە لە سەرجەمی کارگەرانی گشت پیشەکانی تری وڵاتدا .**

**بۆشایی/ بازرگانی پیشەیەکی کۆنە نێستا لەگەڵ زۆربوونی دانیشتوان و پێشکەوتنی شارستانی زیاتر پێشکەوتووە.**

**بۆشایی / چالاکیە ئابووریەکان لە ئاستی بژێوی دا دەمێننەوە بە نەبوونی گواستنەوە .**

# هەڵبژاردنەکانی بەشی یەکەم/ پیشەکیەکی جوگرافیای ئابووری

١. لەگرنگترین جۆری درەختی جەنگەڵە ماناوەندیە نیمچەگەرمەکان( خەزانیەکان ) :
(ئەبەنوس – زان – سەروو – ئورز).

٢. جەوزی ئەمەزۆن دەکەوێتە کیشوەری :
(ئەفریقیا – ئاسیا – ئەمریکای باشور – ئەمریکای باکور).

٣. لە گرنگترین جۆری درەختی جەنگەڵە خولگەییەکان : (زان – ئەسپیندار – ساج – قەستەل).

٤. ئەو ناوچەیەی لەباکوری ئۆراسیا وەرزی گەشەسەندنی کورتە و ئاسکی (ڕەنە )ی لێ بەخێودەکرێت پێی دەوترێت :
(ستێپس – ساڤانا – تەندرا – سیبیریا).

٥. لەگرنگترین درەختی جەنگەڵە ماناوەندیە نیمچەگەرمەکان( خەزانیەکان ) :
(شەربین – ساج – سنەوبەر – گوێزی ئەمریکی بەتولا).

٦. مەرمزەکردن لە تەلان لە ولاتی : (فەرەنسا – ئوسترالیا – تورکیا – فلیپین) دەردەکەوێت.

٧. کانەکانی وەتەرساند بۆ زێڕ دەکەوێتە ولاتی :
( هیندستان – یەکێتی باشوری ئەفریقیا – زامبیا – کۆنگۆی دیموکراتی).

٨. لە چیاکانی ئەندیز لە ئەمریکای باشور هیندیە سوورەکان ئاژەڵی :
(ئەلیاک – ڕەنە – ڕەشەوڵاغ – لاما) بەخێودەکەن.

٩. لەگرنگترین درەختی جەنگەڵە ماناوەندیە نیمچەساردەکان( سنەوبەریەکان ) :
(زان – شەربین – ئورزی یەکسانی - ماهۆکنی).

١٠. لەبەرزاییەکانی ئاسیای ناوەڕاستدا ئەو ئاژەڵەی بەخێودەکرێت پێی دەوترێ :
(ڕەنە – لاما – کاریبۆ – ئەلیاک).

١١. پیشەی کشتوکاڵی بژێوی چڕ لەباشوروباشوری خۆرهەڵاتی ئاسیا دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی :
(١٠ – ٥٠ ، ١٠ – ٥٥ ، ٣٠ – ٥٥ ، ٤٠ – ٦٥ )ی باکور.

١٢. جەنگەڵە ماناوەندیە ساردەکان(سنەوبەریەکان) نزیکەی :
(نیوەی - شەش یەکی – پێنج یەکی - سێ یەکی) ڕووبەری جەنگەڵەکانی گرتۆتەوە.

١٣. لە گرنگترین جۆری درەختە خولگەییەکان : (شەربین – ئەسپیندار – ئەبەنوسی ڕەش – قەستەل).

١٤. بۆشمەنەکان کۆمەڵە خەڵکێکن خەریکن بە پیشەی کۆکردنەوەی سەرەتایی دەژین لە بیابانی :
(گەورەی ئەفریقیا – ئەتەکاما – کەلەهاری – دکن).

١٥. ئەو دیاردەی کە هەمیشە دەبێتە کۆسپ لە ڕێی کشتوکاڵدا لەناوچە خولگەییەکان :
(بەشکاری – داشتن – خولی زەوی کشتوکاڵ – شێوازی کشتوکاڵ).

١٦. بریتیە لەو کردارەی کە مادده خاوەکان دەگۆڕێت بۆ شمەکی دروستکراو :
(کشتوکاڵ – بازرگانی – پیشەسازی – کانزاکاری).

١٧. لەوەڕگەی ئاسکی ڕەنە دەکەوێتە هەرێمی : (تەندرا – چیاکانی ئەندیز- ستێپس - خولگەیی).

١٨. ئەو ناوچەیەی دەکەوێتە یەکێتی باشوری ئەفریقیا و ڕێژەیەکی زۆری زێڕی جیهان لێ بەرهەم دەهێنرێ بریتیە لە :
(میسۆر – وەتەرساند – تۆلا – هۆبی).

١٩. بۆ ئەوەی بە کێڵگەیەکی بازرگانی دابنرێت پێویستە :
(سێ یەکی – نیوەی – پێنج یەکی – شەش یەکی) بەرهەمەکەی بۆ فرۆشتن بێت.

٣٩. یەکێکە لەدرەختەکانی جەنگەڵە خولگەییەکان و پێی دەڵێن کنەدری مانیلا و ڕیشاڵی لێ کۆدەکرێتەوە :
( ئەبەنوسی ڕەش-نورزی یەکسانی-ماهۆکنی-ئەلاباکا ).

٤٠. مەبەست لەمە خۆش کردنی زەوی و ووشك کردنی زەلکاوەکان وداچاندنی زەویەکانە :
( مەرەزەکردن لەتەلان-داشتن-فراوان کردنی ئاسۆیی-فراوان کردنی ستوونی ).

٤١. چالاکیە ئابووریەکان لە ئاستی بژێوی دا دەمێننەوە بە نەبوونی :
( کشتوکاڵ – پیشەسازی – کانزاکاری – گواستنەوە ).

٤٢. ڕادەی بەرهەمی دەریا لەجیهاندا لەبەرهەمهێنانی ماسی دەگاتە : ( ٦/١ – ٥/١ - ٦/٥ – ٦/٢ ).

٤٣. ڕادەی بەهەمی ڕووبار ودەریاناوخۆییەکان لەجیهاندا لەبەرهەمهێنانی ماسی کەمترە لە : ( ٦/١ – ٥/١ - ٦/٥ – ٦/٢ ).

٤٤. ڕێکخستنێکە پێکهاتنە هونەریەکانی بەرهەمهێنانی تێدا لەیەك دەچێت، ئامانجی ئەوەیە کە کەلوپەل وکارگوزاری دیاری کراو بەرهەم بێنێت : ( جوگرافیای ئابووری – پیشە – بازرگانی – داشتن ).

٤٥. ئەم جۆرە درەختە لەهەمان ئەوناوچانەدا هەیە کە ڕووەکە هەڵواسراوەکانیان تێدایە :
( A- ماهۆکنی – B- ئەبەنوس – C- سنەوبەر – هەریەکە لە AوB ).

٤٦. مەبەست لە فراوان بوونی ستوونی کشتوکاڵی بازرگانی بریتیە لە :
( داچاندنی زەوی – چاککردنی خاسیەتی خاك – ووشکردنی زەلکاوەکان – هیچیان ڕاست نین ).

٤٧. ئەم پیشەیە دەکەوێتە ناوچە زۆر کەنارگیرەکان :
( کشتوکاڵی سەرەتایی – پیشەسازی سەرەتایی – شوانکارەی سەرەتایی – کۆکردنەوەی سەرەتایی ).

٤٨. لەوەرگەی ئاسکی ڕەنا دەکەوێتە هەرێمی : ( تەندرا – چیای ئەندیز – نیستێپس – خولگەیی ).

٤٩. خاکی ناوچە خولگەییەکان ماددەی خۆراکی بەتایبەتی ئەندامی کەمە هەرچەندە سامانی ڕووەکیشیان زۆرە بەهۆی :
( تۆپۆگرافیا – هۆکارە ئادەمیەکان – هۆکارە بژێویەکان – کرداری داشتن ).

٥٠. جەنگەڵە مامناوەندیە نیمچە گەرمەکان لە پێکهێنانی جەنگەڵەکانی جیهان بەشداری دەکەن بە ڕادەی :
( ٦/٣ – ٦/٢ – ٦/١ – ٦/٤ ).

٥١. توانای مرۆڤ لەم پیشەیەدا هەرئەوەندەیە کە بتوانێ پێداویستیەکانی خۆی وخێزانەکەی بەرهەم بهێنێ :
( پیشەی ڕاوەکێوی وڕاوی ماسی – پیشەی کشتوکاڵی سەرەتایی –
پیشەی داربڕین لەجەنگەڵەکاندا – پیشەی کانزاکاری ).

٥٢. جیاوازی شوێن دەبێتە هۆی جیاوازی ڕادەی باران بارین و وەرزی بارانەکەی، ئەمەش دەبێتە هۆی :
( A- نیشتەجێ بوونی شوانکارەکان B- وازهێنان لە پیشەی شوانکاری
C- کۆچ ڕەوی ئاسۆیی شوانکارەکان D- هەریەك لە BوC ڕاستە ).

٥٣. ناوچەکانی پیشەی کشتوکاڵی بژێوی چڕ دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی ( ١٠ – ٥٠ ) ی باکور لە :
( باکوری ئەوروپا – ئەمریکای باکور –
باشوری ئەفریقیا – باشوروباشوری خۆرهەڵاتی ئاسیا ).

٥٤. لەگەڵ زۆربوونی دانیشتوان ناوچەکانی ڕاوی وشکانی گۆڕان بە :
( کشتوکاڵی جێ گۆرکێ – کانزاکاری – پیشەسازی قورس – لەوەرگا ).

٥٥. بیابانی کەلەهاری کە بۆشمەنەکانی تێدا دەژی دەکەوێتە :
( باشوری تایلەند – ناوەراستی ئەفریقیا – باشوری خۆرئاوای ئەفریقیا – حەوزی ئەمەزۆن ).

٥٦. جەنگەڵە خولگەییەکان :
( نیوەی - شەش یەکی – پێنج یەکی - سێ یەکی ) سەرجەمی ڕووبەری جەنگەڵەکانی جیهان پێك دێنن.

٥٧. هیچ پەیوەندیەکی ئاشکرا نییە لەنێوان :

( **کانزاکاری وچڕی دانیشتوان** – کشتوکاڵ وسەرمایە – بازرگانی وگواستنەوە – پیشەسازی و دەرامەتی تاکەکەس ).

٥٨. خاوەنی یەکێکە لەو بیردۆزانەی کە باس لە بنچینەی شوێنە ئابووریەکان دەکات لە جوگرافیای پیشەسازی :

( A– فۆن تۆنن B– ئۆگۆست لۆش C–ئەلفرێد فیبر **D- هەریەکە لە BوC راستە** ).

٥٩. کەمی سەرچاوەی بژێوی( کەمی داهات ) لە پیشەی کۆکردنەوەی سەرەتایی بۆتە هۆی :

( بەخێوکردنی ئاژەڵ – **کەمی چڕی دانیشتوان** – نیشتەجێبوون – فراوانکردنی زەوی کشتوکاڵی ).

٦٠. جەنگەڵە مامناوەندیە ساردەکان لەگەڵ جەنگەڵە مامناوەندیە نیمچە گەرمەکان لەیەك دەچن لەڕووی :

( جۆری درەختەکان – شوێنی جوگرافی – **کەمی جۆری درەختەکان** – هیچ کامیان راست نین ).

٦١. لەوناوچانەدا بڵاوبونەتەوە کەئەو بارانەی لێی دەبارێت لە پێویستی بەرووبومی کشتوکاڵ کەمترە :

( A– پیشەی کۆکردنەوەی سەرەتایی وشێوازی کشتوکاڵی تێکەڵ **B– پیشەی شوانکارەی سەرەتایی و شێوازی ئاژەڵ لەوەڕاندن**

C– پیشەی کشتوکاڵی سەرەتایی و پیشەی کشتوکاڵی بژێوی چڕ D– هەریەکە لە AوC راستە ).

٦٢. یەکێکە لەو دوورگانەی کە پیشەی کشتوکاڵی سەرەتایی تێدا دەردەکەوێت :

( کراساو – **مالاگاشی** – هینجام – سەقەلیە ).

٦٣. کەمی ڕاوەماسی لە هەریەکە لە کیشوەری ئەفریقیاوئەمریکای باشوورئوستراليا دەگەڕێتەوە بۆ :

( **تەسکبونەوەی کەنارە کیشوەرەکان** – کەمی ژمارەی دانیشتوان لەوناوچانە

– تێپەڕبوونی هێڵی هاتوچۆکردن – قڕبوونی ماسی بەهۆی ڕاوکردنی زۆرەوە ).

٦٤. بە یەکێك لە ڕێگاکانی فراوان بوونی ئاسۆیی زەویە کشتوکاڵیەکان دادەنرێت :

( **A- وشك کردنەوەی زەلکاوەکان** B- بەکارهێنانی پەیین

C- چاککردنی خاسیەتەکانی خاك D- هەریەکە BوC ڕاستە ).

٦٥. یەکێکە لەو شوێنانەی کە جەنگەڵە خولگەییەکانی تێدا دەردەکەوێت :

( باشوری ئەفریقیا – **باشوری سودان** – باشوری کۆریا – باشوری کوردستان ).

٦٦. ئەم پیشەیە لە ناوچە خولگەییەکان وژوورووەکاندا وەك یەك هەیە و لە چوارچێوەیەکی تەسکدا نەبێت لە بازنەکانی ناوەند دا دەرناکەوێت : ( کانزاکاری – شوانکاری سەرەتایی – **کۆکردنەوەی سەرەتایی** – کشتوکاڵی سەرەتایی ).

٦٧. هیندیە سوورەکان ئاژەڵی لاما بەخێودەکەن لە چیاکانی : ( **ئەندیز** – ئۆراڵ – ئە پەلاشیان – رۆکی ).

٦٨. شوێنە تەنکاوەکانی زەریاکان گرنگترین شوێنی ڕاوەماسین لە کەنارەکانی کیشوەرەکان بەهۆی:

( نزیکی لە بازاڕ – دووری لە تەوژمە دەریاکان

– **بوونی هەڵواسراوەکان** – نزیکی لە شارە گەورەکان ).

٦٩. تواندنەوەی مادده خۆراکیەکانی خاك وگوێزانەوەیان بۆ ناخی زەوی لە ئە نجامی باران بارینی زۆر پێی دەوترێت کرداری :

( هاوسەنگ بوون – داڕوتان – **داشتن** – هیچ کامیان ڕاست نین ).

٧٠. لە گرنگترین ناوچەکانی ڕاوەماسی لە جیهاندا :

( A– زەریای هیندی B– ئایسلەندە تاکو نەرویج

C– نیمچەدورگەی کەمەشتکا **D- هەریەکە لە BوC راستە** ).

٧١. بەرهەمهێنانەکەی ئابووریانە نابێت ڕەنگە لە ڕووبەری دۆنمێکدا تاقە یەك درەختمان دەست بکەوێت :

( زان – ئەلاباکا – **ماهۆگنی** – ساج ).

٧٢. ئەو کۆمەڵە مرۆڤانەن کەلەناوچە یەکسانەکاندا دەژین بە بەرووبومی ڕووەك وەك میوە وگەڵا لەگەڵ ڕاوی گیانەوەردا :

( بۆشمەن – **سیمانك** – هیندییە سوورەکان – ئەسکیمۆ ).

۷۳. ڕیوالی لاستیکی سروشتی و ڕیوالی دارەبەن کۆدەکرێتەوە لە :

( ئەمریکای لاتینی – ئەمریکای باکور – رۆژهەلاتی ئاسیا – رۆژئاوای ئەفریقیا ).

۷٤. کشتوکالی بازرگانی بەشێوەیەکی سەرەکی لە بەشە شێدارەکانی بازنەکانی ناوەراستدا کۆدەبێتەوە وەك لە :

( A- رۆژئاوای ئاسیا B– رۆژئاوای ئەفریقیا C– رۆژئاوای ئەوروپا D– هەریەکە لە C وA راستە ).

۷٥. - درەختی جەنگەڵە خەزانیەکان ( مامناوەندیە نیمچەگەرمەکان ) لە ڕووی بازرگانی نێوان وولاتانەوە گرنگیەکی زۆری هەیە چونکە :

( ڕەق و سەرناوناکەون – کاغەزی چاپەمەنی لێ کۆدەکرێتەوە – بەکاردێن بۆ دروستکردنی خانوو – ڕووەکەکانی هەڵچوون ).

۷٦. پیشەی شوانکارەی سەرەتایی لەکەنارەکانی زەریای ئەتلەسی لە ئەفریقیا درێژدەبێتەوە تا ناوەراستی ئاسیا لەنێوان بازنەی پانی :

( ٥ پلە لە باکورو و ٥٠ پلە لە باشور - ٥ پلە باشور و ٥٠ پلە باکور

- ١٥ پلە باشور و ٥٠ پلە لە باکور - ١٥ پلە لە باکور و ٥٠ پلە باشور ).

۷۷. ڕێژەی کارگەران لە پیشەی کشتوکالی بەرزە و دەگاتە ( ٨٩.٤ ٪ ) ی کۆی گشتی دانیشتوانی :

( چین – هیندستان – بەریتانیا – نێجەر).

۷۸. بەرهەمهێنان بریتیە لە بایەخدان بە خۆراك پەیداکردن بۆ ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان کەلەنیوەی دانیشتوانی جیهان زۆرترن لە :

( پیشەی کشتوکالی سەرەتایی – پیشەی کشتوکالی بژێوی چڕ – پیشەی شوانکارەی سەرەتایی – پیشەی کۆکردنەوەی سەرەتایی ).

۷۹. خاکی ئەم ناوچەیە خۆراکی کەمە بەهۆی کرداری داشتن :

( بازنەی پانی ژوورووەکان – بازنەی پانی خولگەییەکان – بازنەی پانی ناوەندەکان – بیابانەکان).

۸۰. ڕوبەرێکی فراوانی درەختەکانی ئەم جەنگەلانە دەست کرا بە بڕینیان :

( A- جەنگەڵە خولگەییەکان B– جەنگەڵە خەزانیەکان C– جەنگەڵە سنەوبەریەکان D– هەریەکە لە C وA راستە ).

۸۱. خەریکی پیشەی کۆکردنەوەی سەرەتایین لە جەنگەڵە یەکسانەکانی حەوزی ئەمەزۆن لە بەرازیل و ئیکوادۆر وڤەنزویلا :

( هیندیە سوورەکان – کورتە بالاکان – ئەسکیمۆ – بۆشمەن ).

۸۲. لە باشوری سودان دەردەکەوێت :

( A- شێوازی کشتوکالی جیگۆرکێ B– جەنگەڵە خولگەییەکان

C– شێوازی کشتوکالی دەریای ناوەراست D– هەریەکە لە B و A راستە ).

۸۳. ئەمومژو پارچەسەهۆڵی گەورە یەکێکە لەکۆسپەسروشتیەکان کەتووشی ڕاوەماسی دێت لەباکوری خۆرئاوای زەریای ئەتلەسی لەوەرزی:

( پاییز – زستان – بەهار – هاوین ).

۸٤. ناوچەیەکی ئابووری بژێوییە لە کیشوەری ئاسیا :

( باکوری خۆرهەلات – باشوری خۆرهەلات – باشوری خۆرئاوا – باکوری خۆرئاوا ).

۸٥. لە کاتی توانەوەی بەفر لەوەرزی هاویندا هەندێ گیا دەڕوێت کە ئاسکی ڕەنەی لەسەر دەلەوەڕێت ، وەك لە :

( باکوری ئوسترالیا – باکوری ئۆراسیا – باکوری ئەفریقیا – باکوری ئەمەریکای باشور ).

۸٦. ماسی بە بڕبڕەی پشتی ناردەنیەکانی ئەم ولاتە دادەنرێت :

( ئێرلەندە – نیوزلەندە – ئایسلەندە – سکۆتلەندە ) .

۸۷. لە خاسیەتەکانی بەرهەمهێنان کە پیشەی ئابووری بازرگانی لە پیشە بژێوییەکان جیادەکاتەوە :

( بەرهەم لە پێداویستی بەرهەمهێنەکان کەمترە – بەرهەمهێنان شارەزایی( تایبەتمەندێتی ) وکاردابەشکردنی لەگەڵدایە

– پەیدانەبوونی چالاکی بازرگانی وگواستنەوە – کەمی بەرهەمداری تاکەکەس و نزمی ڕاددەی گوزەرانیان).

۸۸. لەهەموکیشوەرەکاندا هەیەبەلام ڕوبەرەکانی بەزۆری کەمن بەڕاددەیەك ناتوانرێت بەشێوەیخاڵ نەبێت لەسەرنەخشەدا دیاری بکرێت:

( کانزاکاری – پیشەسازی – ڕاوەماسی وڕاوی وشکانی – داربڕین ).

٨٩. جەنگەڵە مامناوەندیە نیمچەگەرمەکان( خەزانیەکان ) تەنها لەچەند ناوچەیەکی دیاریکراو هەن لەنیوەی باشوری گۆی زەوی وەك لـە : ( دانیمارك – **ئەرجەنتین** – تورکیا – غینیا ).

٩٠. بەرزترین تێکڕای بەکاربردنی ماسی لەلایەن تاکەکەسێك دەکەوێتە : ( شیلی – **ژاپۆن** – هیندستان –روسیای فیدرال ).

# بەشی دووەم/کشتوکاڵ

**بۆشایی** / چەمکی کشتوکاڵی بەندە بە بایەخ دانێکی مەبەست پێدراو بە **پەروەردەکردنی ئاژەڵ** و **بەرووبوومی کشتوکاڵی** .

وە ئەم چەمکی **کشتوکاڵە** بەستراوەتەوە بە رێکخستنی ڕووی زەوی و گۆڕینی شێوەکەی.

**بەرهەم هێنانی بەرووبووم یان بەخێوکردنی ئاژەڵ ( خاسیەتە خۆییەکانی کشتوکاڵ ) بەستراوە بە :**

**١- خاسیەتە کۆمەڵایەتیەکان و خاوەندارێتی کشتوکاڵ :-**

مەبەست لەو ڕاستیانەیە کە چۆنێتی پەیوەندی بەرهەم هێن ڕوون دەکاتەوە بە زەوی و پەیوەندیەکانی ئەوانەی کاردەکەن بۆ وەبەرهێنانی ،بۆیە قەبارەی کێڵگە و خاوەندارێتیەکەی ئەو جۆرە پەیوەندیەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە .

**کێڵگە ( خاوەندارێتی زەوی )**: ڕووبەرێکە لە زەوی کە سەرا پا یان بەشێکی بەکاردەهێنرێت بە مەبەستی بەرهەم هێنانی کشتوکاڵیی ، کاروباری هونەری و بەڕێوەبەرایەتیەکەشی وەك یەکەیەکی کشتوکاڵی بەڕێوە دەبرێت،کە لەلایەن کەسێکەوە یان چەند کەسێکی دیکە بەیەکەوە وەبەردەهێنرێت بێ ئەوەی گوێ بدرێتە خاوەندارێتی کشتوکاڵی یان قەوارەی یاسا یان فراوانی یاخود شوێنەکەی .

| کێڵگە بچووکەکان | کێڵگە گەورەکان |
|---|---|
| ١- پەیوەندی کۆمەڵایەتی و خێزانی ، سروشتی بچووکی کێڵگەکە دەیسە پێنێت کە بواری ئەندامانی خێزانەکە دەدات بۆ بەجێ هێنانی پێویستیەکانی کاری کێڵگە . | ١- پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر بنچینەی جیاواز دەوەستن کە بنەماکەی پەیوەندی کرێکارە بە خاوەن کارەوە . |
| ٢- کرێکاری کەم کاری تێ دەکات و بە زۆری لە ژمارەی ئەندامانی خێزان پێکهاتووە . | ٢- کرێکار زۆر دەبێت بۆ بەجێ هێنانی پێویستیەکانی بەرهەم هێنانی کشتوکاڵ . |
| ٣- بەکارهێنانی مەکینە زۆر کەمە و زۆر سادەیە . | ٣- بەکارهێنانی مەکینە بە شێوەیەکی فراوانە . |
| ٤- بەرهەم هێنان بە مەبەستی بژێویە . | ٤- بەرهەم هێنان بە مەبەستی بازرگانیە ( فرۆشتنە ). |

**بۆشایی**/ خاوەندارێتی زەویە کشتوکاڵیەکان چەند شێوەیەکی جیاواز وەردەگرێت وەك ئەوەی کە **بۆ هەموو ئەندامانی خێڵەکە بشێت** و **هەندێك جار شێوەی خاوەندارێتی تاکە کەسێك** یان **کێڵگەی ئیشتراکی(هاوبەشی)** وەردەگرێت .

**بۆشایی** / گرنگترین شێوەکانی کێڵگە ئیشتراکیەکان( هاوبەشەکان ) بریتین لە : **کێڵگە هەرەوەزیەکان** و **کێڵگە کۆمەڵیەکان** و **کێڵگە دەوڵەتیەکان** ..

| کێڵگەی تاکە کەس | کێڵگەی ئیشتراکی( هاوبەشی ) |
|---|---|
| ١- **ڕژێمی ( سیستەمی )بەشکاری** : سیفەتێکە لە سیفەتەکانی باری دواکەوتوویی کشتووکاڵی ، کە جوتیار هاندەری نیە پاڵی پێوە بنێت بەرهەمی کشتوکاڵ بەرەو پێش بەرێت و بایەخ بداتە ئاو و زەوی کە سەرچاوەی کشتوکاڵن . | ١- پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان بەندن بە توانا و داد پەروەری کۆمەڵایەتیەوە ، ئەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتیانەش قووت دەدات کە کۆسپ بوون لە ڕێی بەرەو پێش چوونی کشتوکاڵدا . |
| ٢- تا ڕادەیەکی تەواو گیانی هەرەوەزی و سیفەتی کۆمەڵکاری تێدا نیە . | ٢- کارگەران وەك یەك کاردەکەن لە ڕەنجی بەرهەم هێنان و خاوەندارێتی بەرهەم . |

**٢- خاسیەتی ڕێکخستن و هونەرکاری :-** مەبەست لەو چۆنێتیەیە کە بەرهەم هێنان تێیدا دێتە کایەوە هەروەها بەو هۆ و ڕێبازانەی بەکاردەهێنرێن و پەیڕەو دەکرێن بۆ بەجێ هێنانی .

**دابەش بوونی جوگرافی کشتوکاڵی جێ گۆڕکێ :**

١- ئەمەریکای باشوور و ئەمەریکای ناوەڕاست .

٢- ناوەڕاستی ئەفریقیا وباشوری سودان.

٣- باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا ( مالیزیا و ئەندەنوسیا و ڤێتنام و فلیپین )

**خاسیەتەکانی کشتوکاڵی جێ گۆڕکێ :**

١- پارچەیەك زەوی کشتوکاڵ ئامادە دەکرێت دوای ئەوەی لق و پۆپی دارەکان دەبڕدرێت و دارەکانیش دەسووتێنرێت ، لەبەر ئەوە پێی دەوترێت ( کشتوکاڵی بڕەویسووتێنە ) .

٢- کشتوکاڵ لە شێوەی خولی کشتوکاڵدا دەبێت لە چوارچێوەی وەرزەکانی ساڵدا ، ئەم خولەش لە ساڵانی داهاتوودا دووپات دەبێتەوە تا بەرهەم هێنان کەم دەبێتەوە ، ئەو کاتە بەجێ دەهێڵرێت بۆ ئەوەی پارچەیەکی نوێ پاك بکرێتەوە و گەڕانەوەیش بۆ پارچەی یەکەم ٣٠ ساڵ زیاتری پێویستە .

٣- ساکاری تەکنیك وئەوئامێرەی لەم شێوە کشتوکاڵەدا بەکاردەهێنرێت کە لە دارێکی چەماوە تێنا پەڕێت وجاروبارێش تەور بەکاردەهێنرێت .

٤- خێزان یان خێڵەکە خاوەنی زەویە کشتوکاڵیەکەن .

**بۆشایی** /ناوچەکانی شێوازی کشتوکاڵی جێگۆڕکێ گیرۆدەی دەستی داگیرکاری بوون و بەدەستیەوە ئاڵاندویانە .

**خاسیەتەکانی شێوەی کشتوکاڵی بژێوی چڕ :**

١- زۆریی کارگەری کشتوکاڵی .

٢- بچووکیی قەوارەی کێڵگە .

٣- لە تۆڵەی بچووکیی قەوارەی کێڵگە جوتیارەکان هەوڵ دەدەن بۆ زۆرکردنی یەکەی رووبەری زەویەکە ، پەیینی ئاژەڵ و ئادەمی بەکاردەهێنن و ئاووهەواش یارمەتی دەریانە بەتایبەتی گەرما و بارانی زۆر .

**هۆ/ بڵاوبوونەوەی کشتوکاڵی بژێوی چڕ لە باشوور و باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا ؟**

و/ بەهۆی زۆریی کارگەری کشتوکاڵی و بچووکیی قەوارەی کێڵگە . ئاووهەواش یارمەتیدەرە ( بەتایبەتی گەرما و بارانی زۆر ) .

**هۆ/ چاندنی برنج ساڵی زیاد لە جارێك دووپات دەبێتەوە لە یەك کێڵگەدا وەك لە باشووری ژاپۆن ؟**

**هۆ/ بەرهەم هێنانی یەکەی رووبەری زەوی لە باشووری ژاپۆن زۆرە ؟**

و/ بەهۆی زۆریی کارگەریی کشتوکاڵی و بچووکیی قەوارەی کێڵگە و بەکارهێنانی پەیینی ئاژەڵ و ئادەمی.ئاووهەواش یارمەتی دەرە ( بەتایبەتی گەرما و بارانی زۆر ) .

**بۆشایی/** پەیرەوکردنی رێگای کشتوکاڵی برنجی شێدار لەشێوازی کشتوکاڵی بژێوی چڕ ە.

**پەرەسەندنی ئاسۆیی کشتوکاڵ :** بریتیە لەوەی کە فراوانترین بەشی زەوی دابچێنرێت .

**پەرەسەندنی ستوونی کشتوکاڵ :** بریتیە لە زیاد کردنی رێژەی هێزی کارگەر و پەیین لە یەکەیەکی رووبەری زەوی کشتوکاڵ و پەیڕەو کردنی خولی کشتوکاڵ .

**هۆ/کشتوکاڵی بەرویوم پەسند دەکرێت بەسەر ئاژەڵداری لە پیشەی کشتوکاڵی بژێوی چڕ؟**

و/ بەهۆی زۆریی کارگەری کشتوکاڵی و بچووکیی قەوارەی کێڵگە .

**هۆ/ زۆری بڵاوبوونەوەی بەخێوکردنی بەراز لە ناوچە کشتوکاڵیە بژێویە چڕەکاندا ؟**

و/ ① چونکە بەراز لەسەر پاشماوەی کێڵگە و ماڵان دەژی هەروەك هەندێك باڵندە . ② بەهۆی بچووکی قەوارەی کێڵگە .

**دابەش بوونی جوگرافی شێوازی بەرهەم هێنانی سپیایی :**

١- ئەوروپا :لە بەریتانیا و باکووری فەرەنسا درێژدەبێتەوە تا دەگاتە بەشەکانی خۆرئاوای ڕوسیا .

٢- ئەمەریکای باکوور :لە کەنارەکانی زەریای ئەتلەسی لە کەنەدا و وولاتە یەکگرتووەکان درێژ دەبێتەوە بەرەو خۆرئاوا .

٣- ئوسترالیا :باشووری خۆرهەلاتی ئوسترالیا و دورگەی تەسمانیا و دورگەی باکووری نیوزلەندە .

**خاسیەتەکانی شێوازی بەرهەم هێنانی سپیایی :**

١- قەبارەی کێلگە لە شێوازی بەرهەمهێنانی سپیایی دا بچووکە ؟ بەهۆی زۆری چڕی دانیشتوان و بەرزیی نرخی زەوی .

٢- لە چوارچێوەی ئەم شێوازەدا ئاژەڵداری ڕووی کردۆتە مانگا بەخێوکردن بۆ بەرهەمهێنانی سپیایی وەك مانگای هۆلشتاین و جرسی .

٣- لە چوارچێوەی ئەم شێوازەدا کێلگە تەرخان دەکرێت بۆ بەرهەمهێنانی چەشنی تایبەت لەبەروبومی سپیایی بە پێی نزیکیی لە بازاڕەوە، چونکە ئەوانەی نزیکن شیر وسپیایی تازە بەرهەم دەهێنن، لەکاتێکدا دوورەبازاڕەکان کەرەو پەنیرو شیری تۆزی ووشك بەرهەم دەهێنن.

٤- سەرمایەیەکی گەورەی پێویستە بۆ کڕینی ئاژەڵ و ئامێر و خانووبەرە دروست کردن بۆ پاراستنی ئاژەڵ .

٥- بۆ جێبەجێکردنی کاری بەردەوامی ڕۆژانە پێویستی بەژمارەیەکی زۆری کارگەران هەیە ،بۆنموونە دەبێت هەموو ڕۆژێك مانگا دوو جار بدۆشرێت .

٦- ئاژەڵداری پشت بەو ئالیکە دەبەستێت کە لەناو کێلگەدا بەرهەم دەهێنرێن ، یان لەسەر ئەو ئالیکەی لە دەرەوەی کێلگە بەرهەم دەهێنرێت ئەگەر قەوارەی کێلگەکە بچووك بێت .

**کشتوکاڵی تێکەڵ :** مەبەست لەمە ئاژەڵداریە جگە لە کشتوکاڵ کردنی بەروبووم .

**دابەش بوونی جوگرافی شێوازی کشتوکاڵی تێکەڵ :**

١- ئەوروپا :لەو پەڕی خۆرئاوا درێژ دەبێتەوە بۆ ئەو پەڕی خۆرهەلات .

٢- ئەمەریکای باکوور : لە خۆرئاوای چیاکانی ئەپلاشیان درێژ دەبێتەوە تا خۆرهەلاتی دەشتاییەکان .

فراوانترین ڕووبەری شێوازی کشتوکاڵی تێکەڵ دەردەکەوێت لەهەردوو کیشوەری **ئەوروپا و ئەمریکای باکور.**

٣- ئەمەریکای باشوور :باشووری بەرازیل و ناوەڕاستی ئەرجەنتین و شیلی .

٤- ئەفریقیا :دەکەوێتە نێوان یەکێتی باشووری ئەفریقیا و زامبیا .

**خاسیەتەکانی شێوازی کشتوکاڵی تێکەڵ :**

١- کشتوکاڵ کردنی بەروبووم پەیوەندی بە ئاژەڵداریەوە بەهێزە و هەردووکیشیان هاوبەشی لە داهاتی کێلگەدا دەکەن .

**بۆشایی/** بەروبوومی وەبەرهێنانی زەوی لە شێوازی کشتوکاڵی تێکەڵ دەکرێت بە دوو کۆمەڵەوە :-

أ - بەروبوومی ئالیك وەك گەنەشامی . ب- ئەو بەروبوومانەیە کە دەچێنرێن بە مەبەستی بازاڕ وەك گەنم و سەوزە و میوە .

٢- لەم شێوازەدا ئاژەڵی بەراز و مانگای گۆشت و باڵندە( پەلەوەر )بەخێوەدەکرێن .

٣- لەچوارچێوەی ئەم شێوازەدا خولی کشتوکاڵی پەیڕەو دەکرێت کە ئالیکیشی لەگەڵدایە.

٤- سەرمایەیەکی زۆری پێویستە بۆ کڕینی ئاژەڵ و ئامێری کشتوکاڵ .

٥- لە هەموو شێوەکانی تری کشتوکاڵ زیاتر پەیین بەکاردەهێنرێت ،لە ئەوروپا بەرهەمهێنانی پەیین بە گرنگترین مەبەست دادەنرێت بۆ بە خێوکردنی مانگا.

٦- **لەو ناوچانەدا هەیە کە چڕی دانیشتوانیان زۆرە؟**

چونکە پێویستی بە ژمارەیەکی زۆری هێزی کارگەر هەیە ، لە هەمان کاتیشدا بازاڕێکە بۆ ساغ کردنەوەی بەروبوومە کشتوکاڵیەکە .

٧- **کشتوکاڵی تێکەڵ جۆرە ئەرمیەك لە بەرهەم هێناندا بەدی دێنێت ؟**

چونکە کێلگەکە سەرچاوەیەك زیاتری تێدا هەیە وەك بەروبوومی کشتوکاڵی و گۆشت .

**خاسیەتەکانی شێوازی کشتوکاڵی بازرگانی ڕێکخراو :**

١- ئەو سەرمایەیەی بەکاردەهێنرێت بەزۆری بیگانەیە .

٢- ژمارەیەکی زۆر هێزی کارگەر بەکاردەهێنرێت ، هەندێک جار ناوخۆییە و هەندێک جاریش دەرەکیە .

٣- بە شێوەیەکی فراوان پەیین بەکاردەهێنرێت .

٤- شارەزایی و ڕێبازی زانستی پەیڕەو دەکرێت لە کردارە جۆربەجۆرەکانی کشتوکاڵدا .

٥- یەک شێوە بەروبووم بەرهەم دەهێنرێت ، ناوچەیەک بۆ بەروبوومێک تەرخان کراوە ، بۆ نموونە کشتوکاڵی لاستیک لە ئەمەریکای لاتین ، و کێڵگەی کاکاو لە خۆرئاوای ئەفریقیا و قامیشی شەکر لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا .

٦- **کێڵگەکان لە شێوازی کشتوکاڵی بازرگانی ڕێکخراو نزیک کەنارەکانن؟**

چونکە بەرهەم هێنان بەمەبەستی ناردنە دەرەوەیە بۆ بازاڕەکانی جیهان .

**بۆچی**/ کێڵگەکانی شێوازی کشتوکاڵی بازرگانی ڕێکخراو تەرخانکراون بۆ چاندنی ئەو بەروبومانەی کەلەناوچە فێنکەکاندان نین وەک قامیشی شەکر و لاستیک و کاکاو و مۆز .

**بەراورد بکە لە نێوان شێوازی کشتوکاڵی بازرگانی ڕێکخراو :-**

| لە ناوچە خولگەییەکان | لە ناوچە مام ناوەندیە بازنە یانەکان |
|---|---|
| ١- ئەو سەرمایەیەی بەکاردەهێنرێت بەزۆری بیگانەیە . | ١- ئەو سەرمایەیەی بەکاردەهێنرێت سەرچاوەکەی نیشتمانیە. |
| ٢- بەرهەم هێنان بە مەبەستی ناردنە دەرەوەیە بۆ بازاڕەکانی جیهانی . | ٢- بەرهەم هێنان بە مەبەستی پڕکردنەوەی پێویستی بازاڕی ناوخۆی ئەو وڵاتەیە . |
| ٣- وەک ئەمەریکای لاتین و ناوەڕاستی ئەفریقیا و باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا . | ٣- وەک ئەمەریکای باکوور و ئەوروپا و هەندێ ناوچەی قارەی ئاسیا . |
| ٤- گرنگترین بەرهەمەکانی لاستیک و کاکاو و قامیشی شەکر . | ٤- گرنگترین بەرهەمەکانی لۆکە و گەنم و چەوەندەری شەکر. |

**دابەش بوونی جوگرافی شێوازی کشتوکاڵی دەریای ناوەڕاست :**

١- کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست لە ئەوروپا و ئەفریقیا و ئاسیا .

٢- ناوەڕاستی کالیفۆرنیا لە باشووری خۆرئاوای وڵاتە یەکگرتووەکان .

٣- ناوەڕاستی شیلی .

٤- باشووری خۆرئاوای یەکێتی باشووری ئەفریقیا .

٥- باشووری خۆرئاوا و باشووری خۆرهەڵاتی ئوستراليا .

**خاسیەتەکانی شێوازی کشتوکاڵی دەریای ناوەڕاست :**

١. لەهەندێ کێڵگەدا کشتوکاڵ بەمەبەستی بژێوی یەو لەهەندێکی دیکەشدا بەمەبەستی بازرگانیە

٢. **دروست بوونی کشتوکاڵی بەروبوومی هەمەچەشن لە شێوازی کشتوکاڵی دەریای ناوەڕاست ؟**

و/ ① بەهۆی جیاوازی پلەی گەرما و شێ لە هاوین و زستاندا . ② بەهۆی جیاوازی ڕووی زەوی .

٣. **کشتوکاڵی ووشک** : بریتیە لەم جۆرە کشتوکاڵەی کە لەسەر بەرزاییەکانی دەریای ناوەڕاست دەردەکەوێت بەهۆی ئەوەی کە لە هەندێک ناوچەدا باران بێ ئارامە و کەچی لەچاو خۆیدا کەمە ، بۆیە جارێک زەویەکە دەکرێت بە کشتوکاڵ و لە پاشان بۆ ماوەی ساڵێک یان دوو ساڵ بەجێ دەهێڵرێت ، جا لەو ماوەیەدا کە باران دەبارێت زەویەکە دەکێڵرێت بۆ ئەوەی زەویەکە گەورەترین بڕی شێ هەڵبگرێت .

٤. کشتوکاڵ بەشێوەی چەند پشتێنەیەکی ستوونی دەکرێت، لەدەشت ودامێنی دۆڵەکان دا سەوزەو داری زەیتون وەک هەنجیرو ومزرەمەنی دەچێندرێ، ولەدامێنە نزمەکاندا دانەوێڵە دەچێندرێ، ولە دامێنە هەرەلێژەکاندا داری مێو و زەیتون وەک هەنجیر دەچێندرێ.

٥. لەم شێوازەدا ئاژەڵ بەخێوکردن هەیە.گرنگی ئاژەڵ بەخێوکردنەکەش لەکێڵگەیەکەوە بۆ کێڵگەیەکی دیکە دەگۆڕێت،کەلەهەندێ کێڵگەدا بۆکارپێکردنە، لەهەندێکی دیکەیشدا داهاتی سامانی ئاژەڵ سەرچاوەی داهاتی ئاسەرەکی بۆکێڵگەکە پێك دێنێ.




**یەکەم هۆ سروشتیەکان :**

١- **بۆشایی/ تۆبۆگرافیا** لە دوو لاوە کاردەکاتە سەر کشتوکاڵ أ- بە بەرزبوونەوە لە ئاستی ڕووی دەریا ب- پلەی لێژی قەدپاڵەکە و بۆ چ لایەك لێژە

أ - **بەرزبوونەوە لە ئاستی ڕووی دەریا** : ئاوەکو ( ٢٠٠ م ) بەرز بینەوە ، بڕی گەرما ( ١.٨ ) پلە کەم دەکات ، بۆیە ئەگەر لە ئاوچە خولگەییەکان بەرز بینەوە بۆ زیاتر لە ( ٢٠٠ م ) ئەوا کشتوکاڵی بەروبوومی ئاوچەکە فێنکەکان دەبینن وەك گەنم و جۆ و شۆفان ، یانیش بەروبوومەکە دەفەوتێت بەهۆی ئەو زوقمەی کە لەسەر ئاوچە زۆر بەرزەکان دروست دەبێ .

هەروەها بە بەرز بوونەوە بڕی باران بارینیش زیاد دەکات ، بۆ نموونە ئەو بارانەی لە هەرێمی کوردستان دەبارێت زیاد دەکات تا بەرەو باکووری خۆرهەلات بڕۆین ؛ چونکە بەرزی زیاددەکات ، و بۆیە باران بارینەکە دەگاتە ( ١٠٠٠ ملم ) لای چیا هەرە بەرزەکان لە هەرە باکووری خۆرهەلات ، بەلام لە ( ٢٠٠ ملم ) تێنا پەڕێت لە ئاوچەکانی باشووری خۆرئاوای هەرێم .

ب- **پلەی لێژی قەدپاڵەکە و بۆ چ لایەك لێژە** : ئەمەش لە چەند لایەنێکەوە کاردەکاتە سەر کشتوکاڵ ، بۆ نموونە لێژی زۆر دەبێتە هۆی داڕوتانی زەوی ، لەبەر ئەوە کشتوکاڵ زیاتر لە ئاوچە پێدەشتەکان دەکرێت ، زۆر جاریش بۆ ئەوەی دانەڕوتێت دەکرێت بە تەلان .

هۆ/ هەلکەوتنی لێژی زەوی بە گوێرەی بای باراناوی و تیشکی خۆر کاردەکاتە سەر کشتوکاڵ ؟

چونکە ئەو قەدپاڵانەی کە بەرەو بای باراناوین دەتوانرێت زیاتر کشتوکاڵی تێدا بکرێت ، بە پێچەوانەی ئەو قەدپاڵانەی کە ووشکن و لە سێبەری باراندان .

هۆ / ئەو قەدپاڵانەی لە ناوچە وشکەکانی هێڵە پانە خولگەییەکاندایە کە کەمترخۆری بەردەکەوێ بارەکەی دەگونجێت بۆ گەشەکردنی ڕووەك ؟ لەبەرئەوەی بەهەڵم بوون کەمتر ڕوودەدات.

٢- ئاووهەوای کشتوکاڵ :- بریتین لە ڕەگەزەکانی ئاووهەوا ( پلەی گەرما و باران و با و ڕووناکی( تیشکی ) خۆر ) کە کاردەکەنە سەر شێوازەکانی کشتوکاڵ ، کە ئەم کارتێکردنەش بە شێوەیەکی ڕوون لە کەمێك بەرزبونەوە لە ڕووی زەویەوە بە دیاردەکەوێت ، هەربۆیەش بە ئاووهەوای کشتوکاڵ دەناسرێ چونکە ڕووەك تێیدا دەژی و ڕاستەوخۆ کاری لێ دەکات .بۆنمونە بەروبومی گەنم نزمترین ڕادەی لەنێوان سفر – ٥ پلەی سەدی وبەروبومی گەنمەشامی نزمترین ڕادەی لە نێوان ٥ – ١٨ پلەی سەدی دایە،وبەرزترین ڕادەش بەهەردوو بەرویوم لەنێوان ٤٤ – ٥٠ پلەی سەدی دایە .

**کاری پلەی گەرما لەسەر کشتوکاڵ ڕوون بکەرەوە:**

وەرزی گەشەسەندن :ئەو ماوەیەیە کە ڕاددەی گەرمای ڕووەکی هەست پێ دەکرێت، پێویستی ڕووەکیش دەگۆڕێت بە پێی درێژی وەرزی گەشەسەندن.بۆ نمونە کشتوکاڵ کردنی هەندێك بەروبووم پێویستی بەوە هەیە کە وەرزی گەشەسەندن بە درێژایی ساڵ بێت وەك لاستیك و مۆز.کەچی هەندێ بەروبوومی تر تەنها وەرزێکی دیاری کراوی پێویستە لە ساڵێکدا وەك برنج و گەنم .

هۆ/ باران و بڕی ئەو بارانەی کە دەبارێت و وەرزی باران بارینەکە ، کاردەکەنە سەر جۆراوجۆری بەروبوومی کشتوکاڵی ؟

و/ بەهۆی ئەوەی کە هەر بەروبوومێکی کشتوکاڵی پێویستی جیاوازە لەوەی تر ، بۆ نمونە هەندێك بەروبووم ئاوی زۆری پێویستە شان بەشانی وەرزێکی وشکانی ، وەك برنج .کەچی هەندێك بەروبوومی تر بڕێکی دیاری کراو ئاوی پێویستە، وەك گەنم .

**کاری( کاریگەری ) با لەسەر کشتوکاڵ ، ڕوون بکەرەوە :**

و/ بەهۆی ئەو سیفەتانەی کە ( با ) هەیەتی لەبارەی خێرایی وشێی ڕێژەیی و پلەی گەرماوە کاردەکەنە سەر کشتوکاڵ ، بۆنمونە ( بای سیرۆکۆ ) کە بایەکی گەرمە و لە بیابانی گەورەی ئەفریقیا هەڵدەکاتە سەر وڵاتانی مەغریب ، ڕووەکەکانی وەك داری مێو و زەیتوون تووشی زیان دەکات . هەروەها ( بای سموم ) کە بایەکی گەرمە لە بیابانی نیمچە دوورگەی عەرەب هەڵدەکاتە سەر باشووری عێراق لە وەرزی هاوین ، زیان دەگەیەنێ بە بەروبوومی برنج ( مەرەزەکردن ) .

هۆ/ بەهۆی تیشکی خۆرەوە جیاوازی هەیە لە بەروبوومی کشتوکاڵدا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ؟

و/ ① چونکە ئەو تیشکەی کە دەگاتە ناوچەیەك لەگەڵ ناوچەیەکی کەدا جیاوازە .

② ئەوەی کە ڕووەکەکە پێویستیەتی لەو تیشکە بە گوێرەی جۆری ڕووەکەکە دەگۆڕێت .

هۆ/ کشتوکاڵ کردنی ( سۆیا و توتن ) لە ناوچە خولگەییەکاندا سەرکەوتوو نابێت ؟

و/ چونکە سۆیا و توتن بۆ ئەوەی گوڵ بکەن پێویستیان بەوە هەیە کە ڕۆژ کورت بێت ، بەڵام لە ناوچە خولگەییەکان ڕۆژ درێژە .

بۆشایی/چای و کاکاو و قاوە لەسێبەردا دەچێنرێن بۆ ئەوەی لەتیشکی خۆر بپارێزرێن.

هۆ/ ئاووهەوا کاردەکاتە سەر ئاژەڵیش ؟

و/ چونکە جۆری ئەو گژوگیایەی کە ئاژەڵەکە لەسەری دەلەوەڕێت لەسەر باری ئاووهەوا وەستاوە ، وگۆشت و سپیایی ئاژەڵەکەش هەر لەسەر ئەو باری ئاووهەوایەوە وەستاوە ، بۆ نموونە ئەگەر پلەی گەرما لە ( ٥ س ) بۆ( ٣٥ س ) بەرز بۆوە ، ئەوا بەرهەمی شیری مانگایەك لە ( ٢٩ ) ڕەتڵ کەم دەکات بۆ ( ١٧ ) ڕەتڵ لە ڕۆژێك .

٣- خاك : تەنێکە کارلێك کردنی خۆیی تێدایە کە لە نوێ بوونەوە و گەشەسەندن دایە ، و لەو دەنکۆڵانە پێکهاتووە کە قەبارە و ڕێژەیان جیاوازە و پێیان دەوترێت دەنکۆڵەکانی ( لم ) و( قوم و لیتە ) و( تێکەڵ ) .

هۆ/ جیاوازی خاك دەبێتە هۆی جیاوازی بەروبووم ؟

چونکەسەوزەلەخاکی لماویداباشتردەڕوێت وبرنج لەخاکێکدا کە قومی زۆربێت باشتردەڕوێت وگەنمیش لەخاکی تێکەڵ باشتردەبێت.

پوختەی خاك : بریتیە لە دۆخی شلی خاك کە پێکهاتووە لە ئاو و ڕەگەز و ئەوخوێیانەی کە تیایدا تواونەتەوە و گیراوەیەك پێکدەهێنن کە ئاڵوگۆڕکاری ئایۆناتی تێدایە .

**هۆ/ خاسیەتی کیمیاوی و فیزیاوی خاك کاردەکاتە سەر کشتوکاڵ ؟**

و/ چونکە لەسەر بنەڕەتی ژمارەی هایدرۆجینیەوە خاك دابەش دەکرێت بۆ سێ چەشن :

① **خاکی ترشەلۆکی** : ئەو چەشنە خاکەیە کە ژمارەی هایدرۆجینی لە ( ٧ ) کەمتــرە و بە کەڵکی چەشنێکی تایبەتی کشتوکاڵ دێت وەك پەتاتەی شیرین .

② **خاکی تفت** : ئەو چەشنە خاکەیە کە ژمارەی هایدرۆجینی لە ( ٧ ) بەرزترە و بۆ کشتوکاڵ زۆر بەکارنایەت .

③ **خاکی هاوسەنگ**:ئەوچەشنە خاکەیەکە ژمارەی هایدرۆجینی بریتیە لە ( ٧ ) وبۆ زۆرکشتوکاڵ بەکەڵك دێت بەتایبەتی گەنم .

**پیتی زەوی ( خاك )** : واتە خاك تا چەند توانای ئەوەی هەیە ڕەگەزەکانی خواردەمەنی پێویست بداتە ڕووەك لە سـایەی بـاری ئاسـایی گەرما و ڕووناکی و شێ دا .

**دووەم : هۆی ئادەمی ( مرۆیی ) :**

**١- خوونەریتی کۆمەڵایەتی : خاسیەتی جیاوازی دانیشتوان کاردەکاتە سەرکشتوکاڵ، بەدوو شێوە:**

-أ - قۆناغی بەرەو پێش چوونی تەکنەلۆژی. -ب- بیروباوەڕ و خوونەریتی کۆمەڵایەتی .

بیروباوەڕی ئاینی کارێکی ئاشکرای هەیەبۆسەرناوچەجیاوازەکانی جیهان، بۆنموونە هیندۆسەکان بەچاوێکی پیرۆز سەیری مانگا دەکەن کە ئەمەش کاردەکاتەسەرکشتوکاڵ لەهیندستان و وای کردووەڕووبەرێکی فراوانی زەوی ژمارەیەکی زۆری مانگای بێ بەرهەمی تیابەخێو بکرێ.

**هۆ/ کشتوکاڵ نەکردنی گەنمەشامی لە سیلیبس هەرچەندە هەلومەرجی بۆ کشتوکاڵ کردن لەبارە ؟**

و/ بەهۆی بیروباوەڕی کۆمەڵایەتی( بەتایبەتی بیروباوەڕی ئایینی ) خەڵکی سیلیبس سەبارەت بە کشتوکاڵ کردنی گەنمەشامی .

**٢- هۆ ئابووریەکان :**

**هۆ/ تێچوونی گواستنەوە و شوێنی جوگرافی دوو کاری گرنگن بۆ دیاری کردنی جۆر و شوێنی وەبەر هێنانی کشتوکاڵ ؟**

و/ چونکە ئەو زەویانەی نزیك شارن تێچوونی گواستنەوە کەمی تێدەچێت ، لەبەر ئـەوە گـران بـەهان و بـەو بەروبوومانـە دەچـێنرێن کـە نرخیان بەرزە وەك سەوزە و سپیایی ، جا بۆ ئەوەی بەرزترین ڕاددەی وەبەرهێنان بێتەدی شێوازی کشـتوکاڵی چـڕیان تیـادا پـەیڕەو دەکرێت ، بەڵام ئەو زەویانەی دوورە شارن تێچوونی گواستنەوە زۆری تێدەچێت ، بۆیە بـەو بەروبوومانـە دەچـێنرێن کـە گواسـتنەوەی زۆری ئەوێت لەچاو سەنگەکەیدا وەك دانەوێڵە ، بۆیەش کشتوکاڵی فراوانی تیادا پەیڕەو دەکرێت .

**فۆن تونن** : خاوەنی بەناوبانگتـرین ئەو بیردۆزانەیە کە لە ( شوێنی جوگرافی و کاری بۆ سەر دیـاری کردنـی جـۆری وەبـەر هێنـانی زەوی کشتوکاڵ) دەکۆڵێتەوە و ، وای دادەنێت کە شارێك دەکەوێتە ناوەڕاستی ناوچـەیەکەوە لەسـیفاتی سروشـتی و مرۆڤیـدا وەك یەکـە و ، گواستنەوەشی بەڕێی ووشکانیە ، جا لەم بارەدا ئەم پشتێنانە( شێوازانە ) دەردەکەون :

١- پشتێنەی کشتوکاڵی سەوزە و سپیایی ( کە بە دووری شاردایە ) .

٢- پشتێنەی دارستان .

٣- کشتوکاڵی دانەوێڵە کە بە شێوەی خولی کشتوکاڵە .

٤- کشتوکاڵی دانەوێڵە لەگەڵ لەوەڕاندن .

٥- کشتوکاڵی دانەوێڵەی فراوان .

٦- ئاژەڵ لەوەڕاندن .

**بۆشایی** : پشتێنەکانی فۆن تۆنن لەسەرئەو بنەڕەتە دانراون کەتێچوونی گواستنەوە بایەخی گەورەی هەیە لەدیاریکردنی شوێنی وەبەرهێنانی کشتوکاڵی.

**بۆ بازاڕ ئامادەکردن** : مەبەست لە سەرجەم ئەو چالاکیانەیە کە بەشدار دەبن لە گواستنەوەی شمەك لە ناوچەی بەرهەم هێنان بۆ ناوچەی بەکاربردن ، لەم چوارچێوەیەشدا ئامادەکردنی بەروبوومەکە بۆ بازاڕ و جیاکردنەوە و ڕێکخستنی و ڕیزکردنی دەگرێتەوە .

**قازانج** = بەهای بەرهەمەکان – ( تێچوونی بەرهەم + تێچوونی گواستنەوە ) .

٣- هۆ/ ڕامیاری میری و ئەو یاسایانەی دادەنرێن بۆ جێبەجێ کردنی ، ڕۆڵێکی باڵای هەیە لە چالاکی کشتوکاڵدا ؟

وەڵام / (أ) ڕامیاری میری ڕێژەی ئەو زەویانە دیاری دەکات کە بە بەرووبوومێکی تایبەتی دەبەردەهێنرێن وەک لۆکە و قامیشی شەکر و چەوەندەری شەکر .

(ب) هەروەها جۆری ئەو تۆوەی کە بەکاردەهێنرێت دیاری دەکات و دەبینین بەڕێوەبەرایەتیەکانی کشتوکاڵ دابەشی دەکات وەک تووتن و گوڵەبەڕۆژە و لۆکە و هەندێک سەوزە .

(ج) ڕامیاری میری کاردەکاتە سەر قەبارەی کێڵگە بەهۆی ئەو یاسایانەی کە دایدەنێت ، چونکە لەوانەیە سەرکردایەتی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی شان بەشانی ڕژێمێکی ئیشتراکی بێت کە هەوڵ دەدات کێڵگەی هەرەوەزی و کۆمەڵکاری و دەوڵەتی دابمەزرێنێت .

**سێیەم / هۆ بژێوییەکان :** بریتین لە نەخۆشیەکانی ڕووەک وەک ژەنگ کە دووچاری گەنم و قاوە دەبێت ، هەروەها مێرووی وەک کرمی گەڵای لۆکە و زیندەوەرە وردیلە سپیەکان کە دووچاری میوە دەبێت ، لەگەڵ نەخۆشی ئاژەڵ .

هۆ/ بڵاونەبوونەوەی مێشی تسی تسی لە وڵاتەکانی خۆرئاوای عەرەبیدا ؟

و/ چونکە باشترین شوێنەوار بۆ بڵاوبوونەوەی مێشی تسی تسی ناوچە گەرم و شێدارەکانی ناوەڕاستی ئەفریقیایە ، بەڵام بیابانی گەورەی ئەفریقیا بۆتە هۆی ئەوەی ئەخۆشی تسی تسی لە وڵاتەکانی خۆرئاوای عەرەبیدا بڵاو نەبێتەوە .

**نەخۆشی ژەنگی گەنم :** ئەو نەخۆشیە بوو کە گەنم ڕەش دەکات و ساڵی ١٩٥٦ بووە هۆی لەناوچوونی سێیەکی بەرووبوومی گەنم لە هەرێمی کوردستان و باکووری عێراق .

هۆ/ نەمانی چاندنی قاوە لە سریلانکا ؟

بەهۆی بڵاوبوونەوەی ژەنگی قاوە .

هۆ/ کشتوکاڵی مۆز لە کەنارەکانی خۆرهەڵاتی ئەمەریکای ناوەڕاست چووە کەنارەکانی خۆرئاوای ؟

و/ لەبەر بڵاوبوونەوەی نەخۆشی مۆز لە کەنارەکانی کەنداوی مەکسیک ( لە خۆرهەڵاتی ئەمەریکای ناوەڕاست ) .

**هەلومەرجەکانی لەبار بۆ چاندنی گەنم ، چین ؟**

١- بڕی ئەو بارانەی کە دەبارێت دەبێت لە نێوان ( ٢٦ سم ) تا ( ٧٦ سم ) بێت .

٢- وەرزی گەشەسەندن بۆ ماوەی ( ١٠٠ ) ڕۆژ نابێ زوقمی تێدا ڕوویدات .

٣- کشتوکاڵ کردنی گەنم لە خاکی تێکەڵدا دەبێ بکرێت و ئاوەڕۆی باش بێت و ، کارلێکردنی هاوسەنگ بێت و فۆسفۆریشی زۆر بێت چونکە یارمەتی دروست بوونی دەنکۆڵە و نایترۆجین دەدات کە ڕێژەی پرۆتین لە گەنمدا بەرز دەکاتەوە .

٤- هێزی کارگەری کەمی پێویستە .

٥- ئامێر بە شێوەیەکی فراوان بەکاردەهێنرێت .

هۆ/ بەرزبوونەوەیەکی زۆری پلەی گەرما لەگەڵ شێیەکی زۆر کاردەکاتە سەر کشتوکاڵ کردنی گەنم وەک لەسنوری باکوری ئەرجەنتین ؟

و/ چونکە ئەمە بارێکی گونجاو پێکدێنێت بۆ بڵاوبوونەوەی ئەو ڕووەکانەی ئەخۆشی کەڕوو لێی دەدات .

هۆ/ کشتوکاڵ نەکردنی گەنم لە هەرە باشوری خۆرهەڵاتی عێراق ؟

و/ (١) بەهۆی بەرزبوونەوەیەکی زۆری پلەی گەرما لەگەڵ شێیەکی زۆر کە لەوێدا هەیە .

(٢) چەند هۆیەکی تر کە سنووری بۆ ئەو کشتوکاڵە داناوە .

بۆشایی/کشتوکاڵکردنی گەنم لەهەموو کیشوەرەکاندا دەکرێت بەڵام فراوانترین ڕووبەری دەردەکەوێت لە کیشوەری ئاسیا کەدەگاتە سێیەک.

**دابەش بوونی جوگرافی گەنم لە جیهاندا :**

١- ئاسیا : چین و هیندستان .

٢- ئەمەریکای باشوور : ئەرجەنتین .

٣- ئوستـرالیا : باشووری خۆرهەلاتی و باشووری خۆرئاوا .

٤- ئەمەریکای باکوور : وولاتە یەکگرتووەکان و کەنەدا .

٥- ئەوروپا : ڕوسیا و ئۆکرانیا .

**هۆ/ بازرگانی گەنمی دەوڵەتان بایەخێکی گەورەی هەیە ؟**

و/ چونکە بابەتێکی خواردەمەنی سەرەکی بۆ ژمارەیەکی زۆری دەوڵەتان ئامادە دەکات ، ئەم بایەخەش شان بەشانی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و بەرزبوونەوەی ئاستی بژێوی دانیشتوان زیاد دەکات .

**هۆ/** چین و هیندستان لە لیستی ئەو دەوڵەتانە نین کە گەنم دەنێرنە دەرەوە لەجیهان ؟ بە هۆی ئەوەی ژمارەی دانیشتوانیان زۆرە.

**بۆشایی/ لۆکە** کرنگترین بەرهەمی لفکەییە کەمرۆڤ بە کشتوکاڵیەوە خەریك بێت وتا ئێستاش پارێزگاری لەوگرنگییەی کردووە ، وسێیەکی بەرهەمی لۆکە دەچێتە بازرگانی دەوڵەتان.

**هەلومەرجەکانی لەبار بۆ کشتوکاڵ کردنی لۆکە ، چین ؟**

١- دەبێت پلەی گەرما لە (٢١) پلەی سەدی زیاتر بێت بۆ ماوەیەك کە لە پێنج مانگ کەمتـر نەبێت .

٢- وەرزی گەشەسەندن بۆماوەی (٢٠٠) ڕۆژ ئابێ زوقمی تێدا ڕوویدات، چـونکە سـپێتی ودرێـژی تاڵـەکانی بەنـدە بەدرێـژی وەرزی گەشـە سەندنەوە.

٣- پێویستی بە (٥٠) سم باران هەیە .

٤- خاك ئەو ڕۆڵە نابینێت کە پلەی گەرما و باران دەیبینن لە دیاری کردنی ناوچەی بەرهەم هێنانی لۆکە ؟

چونکە کشتوکاڵ کردنی لۆکە لە خاکی جیاوازدا سەرکەوتووە ،بەڵام لە خاکی تێکەڵدا باشتـر دەبێت بەمەرجێك ڕێژەی تفتی زۆر نەبێت .

٥- بۆ کشتوکاڵ کردنی لۆکە دەبێت بارێکی ئادەمی دیاری کراو هەبێت ؟

چونکە پێویستی بە هێزی کارگەری زۆر هەیە بەتایبەتی لە وەرزی چنینەوەی بەروبوومەکەدا ، هەروەها پێویستی بە سەرمایە هەیـە بـۆ کڕینی تۆو و پەیین و دەرمانی قەلاچۆکردنی دەرد ونەخۆشی و ئامێری پێویست .

**هۆ/ کشتوکاڵ کردنی لۆکە بە باشتـرین نموونە دادەنرێت بۆ کشتوکاڵی چر ؟**

و/ چونکە پێویستی بە هێزی کارگەری زۆر هەیە بەتایبەتی لە وەرزی چنینەوەی بەروبوومەکەدا ، هەروەها پێویستی بە سەرمایە هەیـە بـۆ کڕینی تۆو و پەیین و دەرمانی قەلاچۆکردنی دەرد ونەخۆشی و ئامێری پێویست .

**هۆ/ زۆریی شێی ڕێژەدار لە هەوادا بۆ چاندنی لۆکە زۆر لەبار نیە ؟**

و/ چونکە دووچاری مشەخۆری و کرمی قۆزاخەیی لۆکەی دەکات .

**هۆ/ لەو ناوچانەی کە دەکەونە سەر کەنداوی مەکسیك لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا واز لە بەرهەم هێنانی لۆکە هێنرا ؟**

و/ بەهۆی کۆبوونەوەی شێ و گەرمای زۆر کە لۆکە دووچاری مشەخۆری و کرمی قۆزاخەیی دەکات .

**دابەش بوونی جوگرافی لۆکە لە جیهاندا ؛**

١- باشووری خۆرهەلاتی ولاتە یەکگرتووەکان .

٢- قەوقاز و تورکستان .

٣- باکووری چین و حەوزی ڕووباری یانگستی لە چین .

٤- باکووری خۆرئاوای دەکن لە هیندستان .

٥- میصر و سودان .

**بۆشایی** : ناوچەی سەرەکی لە دەرەوە هێنانی لۆکە : دەوڵەتەکانی خۆرئاوای ئەوروپا و ژاپۆن .

**بۆشایی** : ولاتە یەکگرتووەکان لە پێشەنگی ئەودەوڵەتانە دێ کە لۆکە دەنێرنە دەرەوە.

# هەڵبژاردنەکانی بەشی دووەم/کشتوکاڵ

١. کشتوکاڵی ووشك لە شێوازی کشتوکاڵی :

( تێکەڵ – بازرگانی رێکخراو – دەریای ناوەڕاست – بازرگانی چڕ ) دەردەکەوێت.

٢. لە پێشەنگی ئەودەوڵەتانە دێ کە لۆکە دەنێرنە دەرەوە :

( فەرەنسا – وڵاتەیەکگرتووەکان – ژاپۆن – ئوسترالیا ).

٣. لەشێوازەکانی کشتوکاڵی بازرگانی :

( کشتوکاڵی بژێوی چڕ –کشتوکاڵی سەرەتایی – کشتوکاڵی فراوانی دانەوێڵە –کشتوکاڵی جێگۆڕکێ ).

٤. شێوازی کشتوکاڵی فراوانی دانەوێڵە لەبازنەکانی پانیی ناوەڕاستەوە درێژدەبێتەوە لە نێوان هەردوو بازنەی پانی :

( ٥ – ٥٠ ، ١٠ – ٥٠ ، ٢٠ – ٥٥، ١٠– ٥٥ ) ی باکووروباشووری گۆی زەوی.

٥. لە شێوازەکانی کشتوکاڵی بژێوی :

( ئاژەڵ لەوەڕاندن – کشتوکاڵی تێکەڵ – کشتوکاڵی جێگۆڕکێ – بەرهەمهێنانی سپیایی ).

٦. لەوهۆئابووریانەی کاردەکەنە سەر بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ :

( خوونەریتی کۆمەلآیەتی – خاك – بۆبازاڕئامادەکردن – تۆبۆگرافیا ).

٧. شێوازی ئاژەڵ لەوەڕاندن فراوانترین رووبەری داگیرکردووە لە بازنەکانی پانی :

( ناوەڕاست – جەمسەریی – خولگەیی – سارد ).

٨. ئەو وڵاتەی کەبەشداری دەکات لەبازرگانی گەنم لە جیهاندا : ( کەنەدا – هیندستان – چین – بەرازیل ).

٩. ئەو وڵاتەی کە هەژارە بە کشتوکاڵ کردنی لۆکە و لەدەرەوەی دەهێنێت :

( میسر –زامبیا – ژاپۆن – ئوسترالیا ).

١٠. ئەو بەروبومەی کەلە سێبەردا دەچێنرێت بریتیە لە : ( قاوە – برنج – گەنمەشامی – تووتن ).

١١. کشتوکاڵی ببڕە و بسوتێنە بریتیە لە شێوازی کشتوکاڵی :

( بژێوی چڕ- جێگۆڕکێ – بازرگانی رێکخراو – دەریای ناوەڕاست ).

١٢. کێڵگەکانی شێوازی کشتوکاڵی بازرگانی رێکخراو تەرخانکراون بۆ چاندنی ئەو بەروبومانەی کەلەناوچە فێنکەکاندان نین وەك :

( قامیشی شەکر – گەنمەشامی – مزرەمەنی – گەنم ).

١٣. ناوچەسەرەکیەکانی شێوازی بەرهەمهێنانی سپیایی دەردەکەون لە کیشوەری :

( ئاسیا - ئەمریکای باکوور- ئەفریقیا – ئوسترالیا ).

١٤. ئەوبایەی بەهاوین هەڵدەکاتە سەرعێراق وکاردەکاتە سەربەروبومی برنج پێی دەوترێت :

( سیرۆکۆ– تسی تسی– سموم– بازرگانی ).

١٥. ئەو بیردۆزەیە کە لێکۆڵینەوە لەشوێنی جوگرافی و کاربۆ دیاریکردنی جۆری وەبەرهێنانی زەوی دەکات :

( ئەلفرید فیبر – فۆن تۆنن – ئۆگۆست لۆش – فردیناند دیلسبس ).

١٦. سیستەمی سەرەکی وەبەرهێنانی زەوی لە شێوازی ئاژەڵ لەوەڕاندن بریتیە لە بەخێوکردنی ئاژەڵی :

( مەڕ– گامێش– حوشتر– بەراز ).

١٧. ئەوبوارەیەکەمرۆڤ رەنجی خۆی تێدا تەرخان دەکات بەمەبەستی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ یان بەخێوکردنی ئاژەڵ :

( ئاراستە کردنی کشتوکاڵ – خولی زەوی کشتوکاڵ

– وەبەرهێنانی کشتوکاڵ – شێوازی کشتوکاڵ ).

٣٤. ئاژەڵداری ئەو بایەخە گرنگەی نییە لە شێوازی :
(کشتوکاڵی فراوانی دانەوێڵە- کشتوکاڵی تێکەڵ-
کشتوکاڵی دەریای ناوەڕاست- کشتوکاڵی بازرگانی ڕێکخراو).

٣٥. ئەو شێوازەی کشتوکاڵە لەو ناوچانەدا هەیە کە چڕی دانیشتوانی کەمە چونکە دەستی کارگەری زۆری پێویست نییە :
(ئاژەڵ لەوەڕاندن-بەرهەمهێنانی سپیایی-کشتوکاڵی تێکەڵ-کشتوکاڵی بازرگانی ڕێکخراو).

٣٦. ئەو جۆرە خاکەیە کە ژمارەی هایدرۆجینی لە ٧ بەرزترە و بۆ کشتوکاڵ زۆربەکارنایەت :
(خاکی ترشەڵۆکی-خاکی تفت-خاکی هاوسەنگ-بە پیتی خاک).

٣٧. کشتوکاڵ کردنی بە باشترین نمونە دادەنرێت بۆ کشتوکاڵی چڕ :
(چەوەندەری شەکر-لۆکە-گەنم-توتن).

٣٨. کشتوکاڵ کردنی لەناوچە خولگەییەکان سەرکەوتوو نابێت : (قامیشی شەکر-لاستیک-کاکاو-توتن).

٣٩. لە خاکێکدا کە قوڕی زۆربێت باشتر دەڕوێت : (سەوزە-لۆکە-برنج-گەنم).

٤٠. بەگوێرەی بیردۆزەکەی فۆن تۆنن ئەو پشتێنەیەی کەبەدەوری شاردایە بریتیە لە :
(پشتێنەی دارستان- ئاژەڵ لەوەڕاندن-
کشتوکاڵی سەوزەوسپیایی- کشتوکاڵی دانەوێڵە بەشێوەی خولی کشتوکاڵ).

٤١. لە بەناوبانگترین وڵاتانی کیشوەری ئەمریکای باشور لەبەرهەمهێنان وناردنی گەنم :
(بەرازیل-ڤەنزوێلا-نیکوادۆر-ئەرجەنتین).

٤٢. ئەم شێوازی کشتوکاڵیە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا دەرکەوت:
(ئاژەڵ لەوەڕاندن – بەرهەمهێنانی سپیایی – کشتوکاڵی تێکەڵ – کشتوکاڵی دەریای ناوەڕاست).

٤٣. خاوەنی بیردۆزی دابەشبوونی پشتێنە کشتوکاڵیەکانە بەدەوری شاردا :
(فردیناند دیلیبس – ئەلفرێد فیبر –ئۆگۆست کۆنت – فۆن تۆنن).

٤٤. ئەم شێوازی کشتوکاڵیە جۆرە ئەرمییەك بەدی دێنێت لە بەرهەمهێناندا :
(کشتوکاڵی بژێوی چڕ –کشتوکاڵی فراوانی دانەوێڵە – کشتوکاڵی تێکەڵ – کشتوکاڵی بازرگانی ڕێکخراو).

٤٥. کشتوکاڵکردنی گەنم لەهەموو کیشوەرەکاندا دەکرێت بەڵام فراوانترین ڕوبەری دەردەکەوێت لە کیشوەری :
(ئەفریقیا - ئاسیا - ئوستراڵیا – ئەمریکای باکور).

٤٦. بەناوچەیەکی سەرەکی دادەنرێت بۆ هێنانی لۆکە لەدەرەوە :
(میسر وسودان – قەوقاز وتورکستان – چین وهیندستان – خۆرئاوای ئەوروپا وژاپۆن).

٤٧. بەراز لەناوچە کشتوکاڵییە بژێویە چڕەکاندا بڵاوە لە کیشوەری ئاسیا ، چونکە بەخێوکردنی پشت دەبەستێ بە :
(گژوگیای ساڤانا – پاشماوەی کێڵگەکان – بەرهەمی ئالیك – گژوگیای ئیستیبس).

٤٨. سیفەتێکە لەسیفەتەکانی باری دواکەوتوویی کشتوکاڵ :
(خولی کشتوکاڵی – کرداری داشتن – سیستەمی بەشکاری – وەبەرهێنانی زەوی).

٤٩. یەکێك لە خاسیەتەکانی شێوازی کشتوکاڵی بازرگانی ڕێکخراو لە ناوچە خولگەییەکان :
(A–ئەو سەرمایەی بەکاردەهێنرێت بیگانەیە B– بەرهەمهێنان بەمەبەستی پڕکردنەوەی ناوخۆیە
C– پێویستی بەدەستی کارکەری زۆر نییە D– وەبەرهێنانی زەوی تەنها دانەوێڵە دەگرێتەوە).

٥٠. ئاژەڵ لەوەڕاندن لەوناوچانەدا باوە کە :
(A–چڕی دانیشتوانی کەمە B– لەنزیك بازارەکانە
C- پلەیگەرمی وڕادەی شێی بەرزە D– هەریەك لە BوC ڕاستە ).

٥١. لەم شێوازی کشتوکاڵیەدا بە زۆری کشتوکاڵ یەك بابەتە :
( دانەوێڵەی فراوان – تێکەڵ – دەریای ناوەراست – بازرگانی رێکخراو ).
٥٢. خێزان یان خێڵ خاوەنی زەویە کشتوکاڵیەکانن لە شێوازی :
( بەرهەمهێنانی سپیایی – کشتوکاڵی جێگۆرکێ – ئاژەڵ لەوەڕاندن – هیچ کامیان راست نین ).
٥٣. چاندنی ئەم بەروبومە پێویستی بەوە هەیە کە وەرزی گەشەسەندن بەدرێژایی ساڵ بێت :
( گەنم – مۆز – برنج – گەنمەشامی ).
٥٤. لەوناوچانەدا بڵاوبونەتەوە کەئەو بارانەی لێی دەبارێت لە پێویستی بەروبومی کشتوکاڵ کەمترە :
( A- پیشەی کۆکردنەوەی سەرەتایی وشێوازی کشتوکاڵی تێکەڵ B– پیشەی شوانکارەی سەرەتایی و شێوازی ئاژەڵ لەوەڕاندن
C– پیشەی کشتوکاڵی سەرەتایی و پیشەی کشتوکاڵی بژێوی چڕ D– هەریەکە لە A وC راستە ).
٥٥. نەچاندنی گەنمەشامی لە دوورگەی سیلیبس دەگەرێتەوە بۆ :
( هۆکارە ئابووریەکان – خوونەریتی کۆمەڵایەتی – رامیاری ویاسا میرییەکان – نەخۆشی ژەنگ ).
٥٦. لە خاسیەتەکانی شێوازی کشتوکاڵی تێکەڵ :
( سەرمایەی زۆری پێویست نییە – لەم ناوچانەدا هەیە کە چڕی دانیشتوانیان کەمە
– خولی کشتوکاڵی پەیرەو دەکرێت – هەموو وەڵامەکان ڕاستن ).
٥٧. بەهۆی هۆکاری بژێویەوە کشتوکاڵکردنی لە کەنارەکانی خۆرهەڵاتی ئەمریکای ناوەڕاستەوە بۆ کەنارەکانی خۆرئاوا گوێزرایەوە :
( مۆز – قاوە – چەوەندەری شەکر – گەنم ).
٥٨. لەگرنگترین شێوەکانی کێڵگە هاوبەشەکان بریتین لە کێڵگە :
( کۆمەڵییەکان – میرییەکان – هەرەوەزییەکان – هەموو وەڵامەکان راستن ).
٥٩. هەردوو بەروبومی گەنم ولۆکە بۆ بەرهەمهێنانیان وەك یەك پێویستیان هەیە بە :
( دەستی کارگەری زۆر – خاکی تێکەڵ – خاکی تفت – وەرزی گەشەسەندن ١٠٠ رۆژ زوقمی تێداروونەدات ).
٦٠. بری باران بارین لە هەرێمی کوردستان زیاد دەکات تاوەکو بڕۆین بەرەو :
( باکوری خۆرهەڵات – باشوری خۆرهەڵات – باکوری خۆرئاوا – باشوری خۆرئاوا ).
٦١. لە خاسیەتەکانی شێوازی کشتوکاڵی بژێوی چڕ :
( A- بەکارهێنانی پەیینی ئاژەڵی وئادەمی B– بچووکی قەبارەی کێلگە
C– بەخێوکردنی مانگا بۆ مەبەستی سپیایی D– هەریەکە لە A وB راستە ).
٦٢. کشتوکاڵکردنی لۆکە دادەنرێت بە باشترین نمونە بۆ کشتوکاڵی : ( بژێوی – چڕ – جێگۆرکێ – وشك ).
٦٣. بچوکی قەبارەی کێڵگە بە یەکێك لە خاسیەتەکانی ئەم شێوازە دادەنرێت :
( A- بەرهەمهێنانی سپیایی B– کشتوکاڵی بژێوی چڕ
C– ئاژەڵ لەوەڕاندن D– هەریەکە لە B وA راستە ).
٦٤. سیستەمێکە بەکاردەهێنرێت بۆ پێوانەکردنی رێژەی ئەو رووبەرانەی کە تەرخانکراون بۆ هەر بەروبومێکی کشتوکاڵی لەسەرجەمی ئەو رووبەرانەی کەبەکشتوکاڵ کراون :
( سیستەمی بەشکاری – خولی کشتوکاڵی – شێوازی کشتوکاڵی – وەبەرهێنانی کشتوکاڵی ).
٦٥. هۆیەکی یارمەتی دەرە بۆ بەکارهێنانی ئامێر لە شێوازی کشتوکاڵی فراوانی دانەوێڵە :
( کەمی سەرمایە – تەختانی زەوی – بەرزی چڕی دانیشتوان – ئاووهەوای گونجاو ).
٦٦. نزمترین رادەی پلەی گەرمی دەبێت لەنێوان ( سفر – ٥ ) پلەی سەدی دابێت بۆ گەشەکردنی بەروبومی :
( گەنمەشامی – قامیشی شەکر – لۆکە – گەنم ).

٦٧. نزمترین رادەی پلەی گەرمی دەبێت لەنێوان (٥ – ١٨) پلەی سەدی دابێت بۆ گەشەکردنی بەرووبومی :
(گەنمەشامی – قامیشی شەکر – لۆکە – گەنم).

٦٨. ناوچەی سەرەکی بەرهەمهێنانی گەنم لە کیشوەری ئەمریکای باشور دەکەوێتە ولاتی :
(بەرازیل – ئەرجەنتین – شیلی – ڤەنزوێلا).

٦٩. جیاوازی پلەی گەرما و شێ لە هاوین و زستان لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە جیاوازی رووی زەوی لە شێوازی کشتوکاڵی دەریای ناوەراستدا بۆتە هۆی دروست بوونی :
(A- کشتوکاڵی یەك جۆر بەروبوم B– کشتوکاڵی چڕ C– کشتوکاڵی بەروبومی هەمەچەشن D– هەریەکە لە B و C ڕاستە).

٧٠. لە دابەشبوونی پشتێنە کشتوکاڵیەکان لە بیردۆزی فۆن تۆنن لە دەوروبەری شاردا دوورترین پشتێنە بریتیە لە پشتێنەی :
(کشتوکاڵی دانەوێڵە چاندن و لەوەڕاندن – ئاژەڵ لەوەڕاندن – کشتوکاڵی دانەوێڵە بەشێوەی خولی کشتوکاڵی – دارستان).

٧١. چەمکێکە بەستراوەتەوە بە ڕێکخستنی ڕووی زەوی و گۆڕینی شێوەکەی : (داربڕین – کشتوکاڵ – ڕاوی وشکانی – بازرگانی).

٧٢. لەشێوازی کشتوکاڵی تێکەڵ بەرهەمهێنانی پەیین بە گرنگترین مەبەست دادەنرێت بۆ بەخێوکردنی مانگا لە کیشوەری :
(ئاسیا – ئەمریکای باکور – ئەفریقیا – ئەوروپا).

٧٣. لەبەرچووکی قەبارەی کێڵگە، چاندنی بەروبوم پەسند دەکرێت بەسەر ئاژەڵداری لە شێوازی :
(کشتوکاڵی جێگۆڕکێ – ئاژەڵ لەوەڕاندن – کشتوکاڵی تێکەڵ – کشتوکاڵی بژێوی چڕ).

٧٤. کشتوکاڵ کردنی صۆیاوتوتن لەناوچە خولگەییەکاندا سەرکەوتوو نابێت:
(بەهۆی ئەوەی ڕۆژ درێژە – بەهۆی بوونی ئەخۆشی ژەنگ – بەهۆی بوونی مێشوولە – بەهۆی بوونی کوللە).

٧٥. رامیاری ویاسا میرییەکان یەکێکن لە هۆکارە :
(مرۆییەکان – سروشتیەکان – ئابوورییەکان – بژێوییەکان) کە کاردەکەنە سەر کشتوکاڵ.

٧٦. پارچەیەك زەوی کشتوکاڵی ئامادە دەکرێت دوای ئەوەی لق وپۆپی دارەکان دەبڕدرێت و دارەکانیش دەسوتێنرێت، پێی دەوترێت :
(شێوازی کشتوکاڵ – کشتوکاڵی ووشك – ببڕەویسوتێنە – سیستەمی بەشکاری).

٧٧. سێیەکی رووبەری گەنم لە جیهاندا دەچێنرێت لە کیشوەری :
(ئەوروپا – ئەمریکای باکور – ئەمریکای باشور – ئاسیا).

٧٨. بەرفراوانترین رووبەری شێوازی کشتوکاڵی تێکەڵ دەردەکەوێت لە کیشوەری :
(ئەمریکای باکور – ئوسترالیا – ئاسیا – ئەفریقیا).

٧٩. پێویستی بەهێزی کارگەری زۆر هەیە بە تایبەتی لەوەرزی چنینەوەی بەروبومەکەدا :
(قامیشی شەکر – گەنم – لۆکە – توتن).

٨٠. لەو بەروبومانەیە کەلە سێبەردا دەچێندرێن بۆئەوەی لە تیشکی خۆر بپارێزرێن :
(قاوە – چای – کاکاو – هەموو وەڵامەکان ڕاستن).

٨١. ئەو ماوەیەیە کە ڕادەی گەرمای رووەکی هەست پێدەکرێت :
(ئاووهەوای کشتوکاڵی – پوختەی خاك – وەرزی گەشەسەندن – کلۆرۆفیل).

٨٢. ئەو شێوازە لەو ناوچانەدا بڵاوە کە شێدارەو هاوینیشی مامناوەندیەو مەیلەوساردە :
(بەرهەمهێنانی سپیایی – کشتوکاڵی بازرگانی ڕێکخراو – کشتوکاڵی دەریای ناوەڕاست – ئاژەڵ لەوەڕاندن).

٨٣. لە شێوازی بەرهەمهێنانی سپیاییدا کێڵگە تەرخان دەکرێت بۆ بەرهەمهێنانی چەشنی تایبەت لە بەروبومی سپیایی بە پێی :
(تەختانی زەوی – نزیکیی لە بازاڕەوە – دابەشبوونی دانیشتوان – هۆکارە بژێوییەکان).

٨٤. لە ئەنجامی هۆبژێوییەکان ئەم بەروبومە لە ولاتی سیریلانکا بە یەکجاری ئەما :
(قاوە – کاکاو – برنج – گەنمەشامی).

٨٥. باری سروشتی لەم ناوچانەدا لەیەک دەچن بەڵام پەیوەندی لەبارەی رواڵەتی مرۆڤەوە تەواو جیاوازن:
( شوێنی بەرهەمهێنانی لۆکەوگەنم – شێوازی کشتوکاڵی بژێوی چڕ وکشتوکاڵی فراوانی دانەوێڵە
– شێوازی ئاژەڵ لەوەڕاندن ولەوەڕاندنی سەرەتایی – کشتوکاڵی جێگۆڕکێ وبەرهەمهێنانی سپیایی ).
٨٦. ئەم جۆرە بەرهەمە لەناوچە فێنکەکان دەرناکەوێت :
( مۆز – لاستیکی سروشتی – قامیشی شەکر – هەموو وەڵامەکان ڕاستن ).
٨٧. بۆتە هۆی ئەوەی کە چاندنی برنج ساڵی زیادلەجارێك دووبارەبێتەوە لەیەک کێڵگەدا وەك لەباشوری ژاپۆن :
( خاك – خوونەریتی کۆمەلایەتی – گەرماوبارانی زۆر – هۆنابووریەکان ).
٨٨. لەو ناوچانەی کە دەکەونە سەر کەنداوی مەکسیك لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا واز لە بەرهەم هێنانی لۆکە هێنرا بەهۆی :
( دووریی لە بازاڕەکانەوە – کۆبونەوەی شێ وگەرمای زۆر – کەمیی سەرمایە – کەمیی کارگران ).
٨٩. ئەوقەدپاڵانەی لەناوچەوشکەکانی هێڵە پانەخولگەییەکاندایە کە کەمترخۆری بەردەکەوێ بارەکەی دەگونجێت بۆکەشەکردنی ڕووەك لەبەرئەوەی : ( بەهەڵم بوون کەمتر ڕوودەدات – کرداری داماڵین ڕوونادات –
بڕی ئەوبارانەی کەدەبارێت زیاترە – جۆری خاکەکەی بە پیتە ).
٩٠. کشتوکاڵی پێشکەوتوو بەئەنجامی یەکێك لەمانە دادەنرێت : ( ئامێر – مرۆیی – ئاژەڵ – هەموو وەڵامەکان ڕاستن ).
٩١. لە شێوازی کشتوکاڵی فراوانی دانەوێڵە دا :
( پێویستی بە بوونی سەرمایە هەیە – چڕی دانیشتوان بەرزە –
ئاژەڵداری بایەخێکی زۆری پێ دەدرێت – بەروبوم هەمەچەشنە ).
٩٢. لە شێوازی کشتوکاڵی بازرگانی ڕێکخراودا لە ناوچە خولگەییەکان :
( بەشێوەیەکی فراوان پەیین بەکاردەهێنرێت – ئەو سەرمایەی بەکاردەهێنرێت تەنها ناوخۆییە
– خێزان یان خێڵ خاوەنی زەویە کشتوکاڵیەکانن – ژمارەیەکی کەم هێزی کارگەر بەکاردەهێنرێت ).
٩٣. بەرهەمی لۆکە لە جیهاندا : ( نیوە – سێیەك – چواریەك – پێنج یەك ) ی دەچێتە بازرگانی دەوڵەتان .
٩٤. پشتێنە کشتوکاڵیەکانی بیردۆزی فۆن تۆنن لەسەر ئەم بنەڕەتە دامەزراوە :
( تێچوونی گواستنەوە – ئاووهەوا – خاك – تۆپۆگرافیا ) .
٩٥. لە باشوری سودان دەردەکەوێت :
( A- شێوازی کشتوکاڵی جێگۆڕکێ – B جەنگەڵە خولگەییەکان
C– شێوازی کشتوکاڵی دەریای ناوەڕاست – D– هەریەکە لە B و A ڕاستە ).
٩٦. دورگەیەکە کەوا شێوازی بەرهەمهێنانی سپیایی تێدا دەردەکەوێت :
( سەخالین – خەرج – مالاگاشی – تەسمانیا ).
٩٧. لەسنوری باکوری ئەرجەنتین گەنم ناچێندرێت بەهۆی :
( بوونی خاکی تێکەڵ – کەمی سەرمایەی پێویست – بەرزی پلەی گەرماو شێ – کەمی باران بارین ).
٩٨. بەهۆی ئەو سیفەتانەی کە ( با ) هەیەتی کاردەکاتە سەر کشتوکاڵ :
( خێرایی – شێی ڕێژەیی – پلەی گەرما – هەموو وەڵامەکان ڕاستن ).
٩٩. لە ناوچەکانی شێوازی کشتوکاڵی تێکەڵ :
( خولی زەوی کشتوکاڵی پەیڕەو ناکرێت – پەیین بەکارنایەت – چڕی دانیشتوان زۆرە – کشتوکاڵ یەك بابەتە ).
١٠٠. بایەکی گەرمەولەبیابانی گەورەی ئەفریقیاهەڵدەکاتەسەروڵاتانی مەغریب،ڕووەکەکانی وەك داری مێووزەیتوون تووشی زیان دەکات:
( سیرۆکۆ– تسی تسی– سموم– بازرگانی ).

# بەشی سێیەم / سامانی ئاژەڵ

بۆشایی/ هەمە جۆریی سامانی ئاژەڵ پەیوەندی هەیە بە :

١- بەو باری جیاوازی سروشتی ومرۆڤیەوە کە بۆ بەخێوکردنی هەر یەکێك لەمانە پێویستن . ٢- بەجیاوازی مەبەست لە بەخێوکردنیان.

**سامانی ئاژەڵ دەکرێت بە چەند کۆمەڵێك :**

١- ئەوگیانەوەرانەی بۆ بەرهەمەکانیان وەك گۆشت وسپیایی وخوری و پێستە بەخێو دەکرێن،کە مەڕوبزن و مانگا و گامێش دەگرێتەوە .

٢- ئەو گیانەوەرانەی بۆ کارپێکردن لەکێڵگەکاندا بەخێودەکرێن وەك جووت کردن ( هەوجاڕ ڕاکێشان ) یان گوێزانەوەی خەڵك و بەروبوومە کشتوکاڵیەکان،ئەمانەش بریتین لە ئەسپ و ئێستروگوێدرێژ ، بەزۆریش مانگا وگامێش بۆ کارپێکردن لە کێڵگەدا بەکاردەهێنرێن.

٣- ئەو گیانەوەرانەی ماڵی نین واتە کێوین و لە کێڵگەی تایبەتیدا بەخێودەکرێن تا سوود لە بەروبوومیان وەربگیرێت ، وەك کێڵگەی بەخێوکردنی ئەو گیانەوەرانەی فەروەدارن لەوانە ڕێوی زیبوی یان شوێنی ماسی بەخێوکردن .

**پ/داهێنراوە زانیاریە نوێیەکان کەمرۆڤ خستویەتەکاربۆ زیادکردنی بەرهەمی ئاژەڵی و بەرەو پێشبردنی بەرهەمهێنان،بنووسە:**

مرۆڤ لەوەرگای ڕێکخست و شوورەی بەتەل بۆ ڕاکێشاو گیای بۆ زیادکردنی ئەو لەوەرگایە ڕرواند،ناوچەکانی بەرهەمهێنانی بەستەوە بەناوچەکانی بەکاربردنەوە بەهۆی کردنەوەی ڕێگاوبانی هەمەچەشنەوە،سەرەڕای بەکارهێنانی ئامێرەکانی بەستن و ساردکردنەوە ولەقوتوونان،وبەکارهێنانی مەکینە لەبەرهەمی ئاژەڵیدا وەك مانگا دۆشین،وئامادەکردنی ئالیکی پڕ لەخۆراکی سەرەکی بۆ ئاژەڵ،ودروست کردنی بەروبومی سپیایی لەکارگە.

**گرنگی سامانی ئاژەڵ و ڕادەی بەشداربوونی لە ئابووری جیهانیدا :**

١- سامانی ئاژەڵ وای لێهاتووە بۆتە لایەنێکی گرنگ لە داهاتی نەتەوەیی گەلێك لە دەوڵەتە هەمەجۆرەکانی جیهانی ، بۆنموونە سامانی ئاژەڵ بۆتە بڕبڕەی پشتی داهاتی نەتەوەیی نیوزلەندە و ئوستراليا و ئەرجەنتین .

٢- سامانی ئاژەڵ بەشداری لە بازرگانیدا دەکات نەك هەر تەنیا بە گۆشت و سپیایی و خوری بەڵکو بە ئاژەڵی زیندووش .

بۆشایی/ سامانی ئاژەڵ لەو شتانەی دەوڵەتان دیان نێرنە دەرەوە ، بەندە بە بڕی بەرهەمەکانیان و ژمارەی دانیشتوان .

بۆشایی/ سامانی ئاژەڵ لەوناوچانەی کە ژمارەی دانیشتوانیان زۆرە و پلەی گوزەرانیان بەرزە ئەوا کەمتر بەشداری دەکات لە لیستی ئەو شتانەی دەیان نێرنە دەرەوە وەك لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا.

بۆشایی/بازرگانی کردن بەئاژەڵی زیندوو دەکرێت لە نێوان ئێرلەنداوبەریتانیا.وەلەنێوان کەنەدا ومەکسیك لەگەڵ ولاتە یەکگرتوەکان.

**هۆ/ هەڵکەوتنی شوێن لە بازرگانی گۆشتدا ئەو کارتێکردنەی نیە ؟**

و/ چونکە داهێنراوە نوێیەکان هۆی گواستنەوەیان ئاسان کردووە بەتایبەتی ڕێگای دەریا کە بۆ ماوە و مەودای دوور بەکاردێت ، بۆیە زۆربەی ولاتانی نیوەگۆی باشووری زەوی لە بازرگانی نێوان دەوڵەتاندا بەشدارن بەتایبەتی ئوستراليا و نیوزلەندەو ئەرجەنتین ، هەرچەندە بازاڕەکانیان دەکەونە نیوەگۆی باکووری زەوی ، بەتایبەتی قارەی ئەوروپا .

**پ/ کاری داهێنراوە نوێیەکان لە ناردنە دەرەوەی بەرهەمی سپیایی ، ڕوون بکەرەوە :**

**هۆ/ داهێنراوە نوێیەکان یارمەتی کەم کردنەوەی کارتێکردنی شوێن دەدەن لە ناردنە دەرەوەی بەرهەمی سپیایی ؟**

و/ چونکە دەتوانرێت شیری تەڕ بکرێت بە شیری ووشك ( تۆز ) یان بخرێتە قوتووەوە یان سارد بکرێت ، تا وای لێهاتووە کە بەرهەمەکانی نیوزلەندە لە کەرە ( زبدة ) لە بازاڕەکانی بەریتانیا بفرۆشرێ .

٣- بەرهەمە ئاژەڵیەکان لایەنێکی گرنگیان لە داهاتی کێڵگەدا پێکهێناوە لە هەموو ئەو شێوازە کشتوکاڵیە جیاوازانەی کە بایەخ بە بەخێوکردنی گیانەوەر دەدەن .

٤- بایەخی سامانی ئاژەڵ وەك سەرچاوەیەکی خۆراك پاڵی بەو دەوڵەتانەوە ناوە کە لەوەڕگایان کەمە ، بۆ جیاکردنەوە و تەرخان کردنی ڕووبەرە زەویەکی زۆر بۆ ئالیك چاندن هەرچەندە پێویستیان بە بەروبوومی کشتوکاڵی هەیە وەك لە ولاتی میصر .

٥- بەخێوکردنی ئاژەڵ دەرفەتی کارکردن بۆ ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوان دەهێنێتە دی ، جا ئەمە لە ڕووی چاودێریەوە بێت یاخود بۆ کارکردن لە پیشەسازی گۆشت لە قوتونان و خوری چنین و پیشەسازی پێستە و پێستەخۆش کردن بێت.

٦- هەندێك بەرهەمی ئاژەڵ دەبنە سەرچاوەی داهاتی ئاسەرەکی لە شێوەکانی کشتوکاڵی وەك هێلکە و مریشکداری و گیانەوەری فەروودار و بەخێوکردنی ماسی .

**هۆ/ مانگا لە هەموو شێوەکانی کشتوکاڵیدا بەدی دەکرێت ؟**

چونکە لە ناوچەکانی بەرهەم هێنانی سپیاییدا هەر لە تەمەنی ( ٢ ) هەتا ( ١٥ ) ساڵی شیردەدات ، لە ناوچەی لەوەڕگا بازرگانیەکانیشدا لە تەمەنی ( ٢ ) ساڵیەوە بۆ گۆشتەکەی سەری دەبڕن .

**هۆ/ هیندستان یەکەم دەوڵەتە کە مانگای زۆر بێت ، لەگەڵ ئەوەشدا پایەیەکی گرنگی لە ژیانی ئابووریدا نیە ؟**

چونکە هیندۆسەکان بە چاوێکی پیرۆز سەیری مانگا دەکەن و سەری نابڕن ، لەبەر ئەوە مانگای لاواز و کەم شیر زۆر بووە و توانای کارکردنیشیان کەمە .

**بۆشایی/** بەخێوکردنی مانگا بەمەبەستی بەرهەمی سپیایی لە بەشەکانی باکووری خۆرهەڵاتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا دەردەکەوێت چونکە ئاووهەواکەی شێدار و مەیلەو ساردە و بۆ بەخێوکردنی مانگای شیردەر دەشێ . هەروەها لە ناوچە لەوەڕگاکانی خۆرئاوای ناوەند لە نێوان پووش و پاوانەکان مانگا بۆ گۆشتەکەی بەخێودەکرێت .

**هۆ/ بەرهەمی گۆشتی مانگا لەبەرازیل ناگونجێ لەگەڵ ژمارەی ئەو مانگایانەی کەهەیەتی ؟**

**بەهۆی ئەو کۆسپانەی دێنە پێش بەخێوکردنی مانگا لە بەرازیل کەئەمانەن:**

١- خراپیی جۆری گژوگیا . ٢- بڵاوبوونەوەی جۆرە مانگای خراپ . ٣- زۆریی مێش و مەگەز . ٤- کەمیی ئاو لە هەندێ وەرزی ساڵدا .

٥- نەبوونی ڕێگاوبانی تەواو .

**بۆشایی /** بەرازیل خاوەنی نزیکەی نیوەی مانگای کیشوەری ئەمریکای باشورەو مانگای شیردەر لە بەرازیل لە باشوری ولاتدا بەخێودەکرێت.

**هۆ/ چین لە ڕووی مانگا زۆریەوە لەدوای ولاتە یەکگرتووەکان دێت ، بەڵام جیاوازی هەیە لە ولاتانی تر ؟**

چونکە بەخێوکردنی مانگا پەیوەندی بە جێبەجێ کردنی کاری کێڵگەییەوە هەیە ، هەروەك ناوچەکانی تری باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا کە ناوچەی ئابووری بژێویە .

**دەشتی بەمباس :** دەشتێکە دەکەوێتە باکووری ئەرجەنتین کە بە زۆریی سامانی ئاژەڵ ( مانگا ) ناوبانگی دەرکردووە کە بارانی بە ئەندازەی پێویست لێ دەبارێت ئەمەش یارمەتی ژیانەوەی گژوگیا دەدات .

**هۆ/ دەشتی بەمباس لە ئەرجەنتین بە زۆریی سامانی ئاژەڵ ( مانگا ) ناوبانگی دەرکردووە ؟**

**هۆ/ئەرجەنتین بە پلەی سێیەم دێت لەجیهاندا لەڕووی بەرهەمی گۆشتی مانگاوە،هەرچەندە لە پلەی پێنجەم دایەلە ڕووی ژمارەی مانگاوە؟**

و/ ① باران مام ناوەندیە و ئاووهەواکەی بە درێژایی ساڵ یاریدەی بەردەوام بوونی لەوەڕاندن دەدات .

② ئەرجەنتین توانیویەتی گژوگیای نوێ بهێنێتە ئەم ناوچانە بۆ چاك کردنی خواردەمەنی مانگا .

③ هەوڵی داوە ناوچەیەکی فراوان بە تەل پەرژین بکات .

④ بەکارهێنانی هۆی بەستن و ساردکردنەوە و پیشەسازی گۆشت .

**هۆ/ باکووری خۆرئاوای ئەوروپا ناوچەیەکی سەرەکیە بۆ بەخێوکردنی مانگای شیردەر ( سپیایی ) ؟**

بەهۆی ① بەکارهێنانی ئەو ڕێگایانەی بۆ بەرهەمهێنانی سپیایی بەکاردێن زۆر پێشکەوتوون .

② تێکڕای ئەو شیرەی مانگاکەش بەرهەمی دێنێ زۆرە .

**ناوچەی فیلدا :** گرنگترین ناوچەی بەخێوکردنی مانگای گۆشتە لە یەکێتی باشووری ئەفریقیا بەهۆی بڵاوبوونەوەی گژوگیای سافانا ، و لەوەڕاندنیش لەم ولاتە بە مەبەستی بازرگانیە .

**هۆ/ بەرهەم هێنانی گۆشتی مانگا لە یەکێتی باشووری ئەفریقیا لە ولاتەکانی تری ئەفریقیا زۆرترە ؟**

بەهۆی بڵاوبوونەوەی گژوگیای سافانا و لەوەڕاندنیش لەم ولاتە بەمەبەستی بازرگانیە .

پ/ ئەم دەستەواژەیە بە نموونە ڕوون بکەرەوە : ( بەخێوکردنی مەڕ لە چەند وڵاتێکدا بەمەبەستی خوریە ولە هەندێك وولاتانی تریش بەمەبەستی گۆشتە ) .

و/ بەخێوکردنی مەڕ لەئوستـرالیا بەمەبەستی گۆشت وخوریە ، مەڕی گۆشت لەوناوچانەن کە تا ڕاددەیەك بارانیان زۆر لێ دەبارێت وەك لەباشووری خۆرهەڵات ، لەکاتێکدا مەڕی خوری لەوناوچانەن کەبارانیان کەمە وەك باشووری خۆرئاوا ، لەگەڵ خۆرئاوای بەرزاییەکانی خۆرهەڵات .

هۆ/ ئوستـرالیا پلەی یەکەمی هەیە لە بەرهەم هێنانی خوری لە جیهاندا ؟

هۆ/ لە ئوستـرالیادا بەرهەم هێنانی خوری لە بەرهەم هێنانی گۆشت زۆرترە ؟

و/ ① باری ووشکی ئاووهەوا زیاتر زاڵە کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی خوریی باشی تێدا هەڵبکەوێ لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە دەبێتە هۆی کەمیی بەرهەم هێنانی گۆشت .

② زۆربوونی داواکاریی بۆ خوری .

③ هەبوونی ڕێگای گواستنەوەی ئاویی هەرزان .

④ لەوەڕاندن بەمەبەستی بازرگانیە لە ئوستـرالیا .

بۆشایی / ووشکی ئاووهەوا وای کردووە کە مەڕ بەخێوبکرێت بەمەبەستی خوریەکەی لە یەکێتی باشوری ئەفریقیا وبانی ئەنادۆڵ .

بۆشایی / ئەرجەنتین زۆرترلەنیوەی بەرهەمی خوری بەرهەم دەهێنێت لە کیشوەری ئەمریکای باشور.

هۆ/ بەخێوکردنی بەراز لە هیندستان هیچ بایەخێکی پێ نادرێت هەرچەندە شێوازی کشتوکاڵی پڕێوی چڕیشی تێدا بڵاو بۆتەوە ؟

چونکە هیندۆسەکان خۆیان لە بەخێوکردنی لادەدەن و بە گیانەوەرێکی پاکی نازانن .

هۆ/ بەخێوکردنی بەراز لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا نیە ؟ چونکە ئایینی ئیسلام گۆشتی بەرازی حەرام کردووە .

بۆشایی / دانیمارك بە پێشەنگی دەوڵەتانی ناردنە دەرەوەی گۆشتی بەراز دادەنرێت.

بۆشایی / چین خاوەنی سێیەکی ژمارەی هەموو بەرازی جیهانە .

بۆشایی / بزن لەسەر پاشماوەی کێڵگەکان بەخێودەکرێت بۆ سوود وەرگرتن لە شیرەکەی.

هۆ/ بەخێوکردنی بزن لە زۆربەی ناوچەکانی جیهان ناپەسندە ؟ هۆ/ هاوبەشیەتی بزن لە ئابووری جیهانیدا کەمە ؟

چونکە ئاژەڵێکی لاواز و کەم شیرە ودەبێتە هۆی وێران کردنی لەوەڕگا ، بۆیە لەو ناوچانەی کە شێوەی لەوەڕاندنیان بەمەبەستی بازرگانی تێدا بڵاوە حەز لە بەخێوکردنی ناکەن .

بۆشایی / چین و هیندستان سێیەکی ژمارەی بزنی هەموو جیهانیان هەیە .

بۆشایی/ گامێش لە ئاژەڵەکانی تر جیادەکرێتەوە بە ژمارە کەمی و دابەش کردنە جوگرافیاییەکەی ؟

و/ چونکە ژمارەی گامێش لە جیهاندا لە ( ١٥ ) ملیۆن سەر پتـر نیە و بەخێوکردنیشی بەزۆریی دەکەوێتە قارەی ئاسیا کە ( ٩٨٪ )ی گامێشی جیهانی تێدایە بە تایبەتی لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا .

بۆشایی/ هیندستان نزیکەی نیوەی ژمارەی گامێشی جیهانی تێدایە .

بۆشایی/ زۆرتر لە نیوەی ژمارەی ئەسپی هەموو جیهان لە هەردوو ئەمەریکادایە بەتایبەتی وڵاتە یەکگرتووەکان و بەرازیل .

بۆشایی/ حوشتـر تەنیا لە قارەی ئاسیا و ئەفریقیا دا هەیە

سودان و سۆماڵ دوو هەرێمی سەرەکین لە رووی ژمارەی حوشتـر ، دوای ئەوان هیندستان و چین دێن .

هۆ / کەمبوونەوەی گیانەوەرەکانی کارپێکردن لەشێوەکانی کشتوکاڵی بازرگانیدا ؟

و/ بەهۆی بەکارهێنان و پشت بەستن بە ئامێر لەئیش وکاری کشتوکاڵیداوەك لە ئوستڕالیا ونیوزلەندە .

**دابەش بوونی جوگرافی ( مانگا ، مەڕ ، بەراز ، بزن ، گامێش ) لە جیهاندا .**

| مانگا لە جیهاندا | مەڕ لە جیهاندا | بەراز لە جیهاندا |
|---|---|---|
| ١- هیندستان | ١- چین | ١- چین |
| ٢- وڵاتە یەکگرتووەکان | ٢- ئوستـراليا | ٢- هیندستان |
| ٣- بەرازیل | ٣- ئێران | ٣- باکوری خۆرئاوای ئەوروپا ( دانیمارک ) |
| ٤- چین | ٤- نیوزلەندە | ٤- وڵاتە یەکگرتووەکان |
| ٥- ئەرجەنتین | ٥- هیندستان | ٥- بەرازیل |

| بزن لە جیهاندا | گامێش لە جیهاندا |
|---|---|
| ١- هیندستان | ١- باشوور و باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا وەک هیندستان و چین |
| ٢- چین | ٢- لە ئەفریقیاش میصر . |
| ٣- بیابانی ئەنەدۆڵ ( تورکیا ) | |
| ٤- ئەسیوبیا | |

# هەڵبژاردنەکانی بەشی سێیەم / سامانی ئاژەڵ

١. یەکەم دەوڵەت لەبەرهەم هێنانی خوری لە جیهاندا بریتیەلە : ( نیوزیلاند – هیندستان – تورکیا – **ئوسترالیا** ).

٢. مانگا بەخێوکردن بەمەبەستی بازرگانی لە ئەرجەنتین دەکەوێتە ناوچەی : ( ڕەند – فیلد – مەنزۆلا – **بەمباس** ).

٣. ئەو دەوڵەتەی کە بە پلەی یەکەم دێت لە بەرهەمهێنانی خوری بە پلەی سێیەم دێت لە بەرهەمهێنانی گۆشتی مانگا لەجیهاندا :
( ئێران – تورکیا – ئەسیوبیا – **ئوسترالیا** ).

٤. یەکەم دەوڵەتە لەڕووی ژمارەی مانگاوە بەڵام مانگا هیچ پایەیەکی گرنگی لە ژیانی ئابووریدا نییە :
( ئەرجەنتین – نیوزیلاند – **هیندستان** – سودان ).

٥. ئاژەڵێکی لاوازە و کەم شیرە ودەبێتە هۆی وێرانکردنی لەوەڕگەکان : ( گامێش – مەڕ – **بزن** – بەراز ).

٦. بە پێشەنگی دەوڵەتانی ناردنە دەرەوەی گۆشتی بەراز دادەنرێت : ( هۆڵەندا – چین – **دانیمارک** – هیندستان ).

٧. ئەو گیانەوەرانەی مالی نین واتە کێوین و لە کێڵگەی تایبەتیدا بەخێودەکرێن تا سوود لە بەرووبوومیان وەربگیرێت ، وەك :
( ئەسپ – **ڕێوی زیبوی** – گامێش – مانگا ).

٨. گامێش ئاژەڵێکی ئاسیاوییە چونکە کیشوەری ئاسیا نزیکەی : ( ٩٥٪ – ٩٠٪ – **٩٨٪** – ٩٢٪ ) ی گامێشی جیهانی تێدایە.

٩. ئەو دەوڵەتەی خاوەنی سێیەکی ژمارەی هەموو بەرازی جیهانە : ( **چین** – هیندستان – دانیمارک – بەرازیل ).

١٠. ئەوناوچەیەکەلەیەکێتی باشوری ئەفریقیا مانگای تێدا بەخێودەکرێت بەمەبەستی بازرگانی :
( **فیلد**-بەمباس-وەتەرساند –ڕەند ).

١١. لەوگیانەوەرانەی بەخێودەکرێن بەمەبەستی بەرهەمەکانیان وەك : ( هێستر – ڕێوی زیبوی – **مەڕ** – ماسی ).

١٢. بە دەوڵەتێکی سەرەکی لەناردنەدەرەوەی بەرهەمی ئاژەڵی دادەنرێت :
( وڵاتە یەکگرتووەکان – کەنەدا – **ئەرجەنتین** – دانیمارک ).

١٣. ئەو ئاژەڵەی کە لە بەخێوکردنی جیادەکرێتەوەلەگەڵ ئاژەڵەکانی تری وەك مانگا ومەڕ بریتیە لە :
( **گامێش** –بەراز – بزن –ئەسپ ).

١٤. بەخێوکردنی مانگا پەیوەندی بە جێبەجێکردنی کاری کێڵگەییەوە هەیە لە :
( بەرازیل – ئەسیوبیا – **چین** – نیوزلاند ).

١٥. سودان و سۆماڵ دوو هەرێمی سەرەکین لە ڕووی ژمارەی : ( مانگا – ئێستر – **حوشتر** – ئەسپ ).

١٦. ئەوەی یارمەتی پەیدابوونی بەخێوکردنی مانگای داوە لە یەکێتی باشوری ئەفریقیا بلاوبونەوەی گژوگیای :
( ئستێپس – ڕووەکی تەندرا – ڕووەکی دڕکاوی – **ساڤانا** ).

١٧. ئەو ئاژەڵەی لەهەموو شێوەکانی(شێوازەکانی ) کشتوکاڵیدا بەدی دەکرێت :
( مەڕ – **مانگا** – گامێش – بزن ).

١٨. بە پلەی سێیەم دێت لەجیهاندا لەڕووی بەرهەمی گۆشتی مانگا هەرچەندە لە پلەی پێنجەم دایە لەڕووی ژمارەی مانگا :
( بەرازیل – چین – **ئەرجەنتین** – هیندستان ).

١٩. دەشتی بەمباس لە ئەرجەنتین بە زۆریی سامانی ئاژەڵ ناوبانگی دەرکردووە بەتایبەتی :
( مەڕ – **مانگا** – گامێش – بەراز ).

٢٠. هەندێك بەرهەمی ئاژەڵ دەبنە سەرچاوەی داهاتی ناسەرەکی لەشێوازەکانی کشتوکاڵی وەك :
( **هێلکە**-گۆشت-خوری-شیر ).

٢١. سامانی ئاژەڵ بۆتە لایەنێکی گرنگ لەداهاتی نەتەوەیی :
( وڵاتە عەرەبیەکان-**نیوزلەندە**-کەنەدا-چیك ).

٣٨. تەنها لە نێوان وڵاتە دراوسێکاندا بازرگانی پێوە دەکرێت :
(وزەی کارەبا وفۆسفات – خوری ئاژەڵی زیندوو – ئاژەڵی زیندوو و فۆسفات – ئاژەڵی زیندوو و وزەی کارەبا ).
٣٩. هیچ وڵاتێك نییە شان لەشانی ئوسترالیا بدات لە بەرهەمهێنانی : (گۆشت – خوری – سپیایی – پێستە ).
٤٠. زۆرترلەنیوەی بەرهەمی خوری بەرهەم دەهێنێت لە کیشوەری ئەمریکای باشور :
(بەرازیل – ئیکوادۆر – شیلی – ئەرجەنتین).
٤١. سێیەکی ژمارەی بزنی جیهانی تێدایە :
(کەنەدا و وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا – تورکیا و ئەسیوبیا –
– چین و هیندستان – ئوسترالیا و نیوزلەندا ).
٤٢. بەرهەمی گۆشتی مانگا ناگونجێ لەگەڵ ژمارەی ئەو مانگایانەی کە هەیەتی :
(ڤەنزوێلا – بەرازیل – ئەرجەنتین – بۆلیفیا ).
٤٣. پشت بەستن بە ئامێر لە نیش وکاری کشتوکاڵیدا ،کاری کردۆتە سەر کەمبونەوەی گیانەوەرەکانی کارپێکردن هەروەك لە :
(A- ئوستراليا B– بەرازیل C– نیوزلەندە D– هەریەکە لە Cو A راستە ).
٤٤. هیندستان وچین : (نیوە – سێیەك – چواریەك – پێنج یەك ) ی ژمارەی بزنی هەموو جیهانیان هەیە.
٤٥. لەسەر پاشماوەی کێڵگەکان بەخێودەکرێت بۆ سوود وەرگرتن لە شیرەکەی :
(A- بزن B– بەراز C– مەڕ D– هەریەکە لە Aو B راستە ).
٤٦. بەخێوکردنی مانگای شیردەر لە وڵاتی بەرازیل دەکەوێتەبەشی : (باکور – خۆرهەڵات - باشور –خۆرئاوا ) .
٤٧. بە بڕبڕەی پشتی داهاتی نەتەوەیی نیوزلەندەوئوسترالیاوئەرجەنتین دادەنرێت :
(سەرچاوەکانی ووزە – کانزاکاری – پیشەسازی پترۆکیمیاوی – سامانی ئاژەڵ ) .
٤٨. سامانی ئاژەڵ لەوناوچانەی کە ژمارەی دانیشتوانیان زۆرە و پلەی گوزەرانیان بەرزە ئەوا کەمتر بەشداری دەکات لە لیستی ئەو شتانەی دەیان نێرنە دەرەوە وەك لە : (ئوستراليا - وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا – نیوزلەندە – چین ) .
٤٩. زۆریی بەرهەمهێنانی خوری لە ئوسترالیا دەگەڕێتەوە بۆ :
( تەختانی زەوی – باران بارینی زۆر – وشکی ئاووهەوا – شوێنی جوگرافی ).
٥٠. بەخێوکردنی مانگا بەمەبەستی بەرهەمهێنانی سپیایی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەبەشەکانی :
(باکوری خۆرهەڵات – باشوری خۆرهەڵات – باکوری خۆرئاوا – باشوری خۆرئاوا ) دایە.

# بەشی چوارەم /سەرچاوەکانی ووزە

| خەڵوزی ئەنتراسایت | خەڵووزی بتیۆمین ( قیری ) | خەڵوزی لەگنایت |
|---|---|---|
| ١- ڕێژەی کاربۆن تیایدا لە ٩٠٪ زیاترە .<br>٢- مێژووی دروست بوونی دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی جیۆلۆجی یەکەم .<br>٣- ڕەقە و گەشە و بەچاکی دەسووتێت و ، بەکاردێت بۆ بەرهەم هێنانی ووزە و کاروباری ناوماڵ .<br>٤- لە ڕۆژهەڵاتی چیاکانی ئەپلاشیان لە ولاتە یەکگرتووەکان و خوارووی ویڵز لە ئینگلتەرا و لە ڕوسیا دا هەیە . | ١- ڕێژەی کاربۆن تیایدا لە نێوان ( ٧٠-٩٠٪ ) دایە .<br>٢- مێژووی دروست بوونی دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی جیۆلۆجی دووەم .<br>٣- لە پیشەسازیدا بەکاردێت وەك سەرچاوەیەکی ووزە و کەرەستەیەکی خاوە بۆ دروست کردنی خەڵوزی کوك و بەرهەمهێنانی گاز( غاز)..<br>٤- لە حەوزی ڕۆر لە ئەڵمانیا و باکووری خورهەڵاتی ئینگلتەرا و بەلجیکا دا هەیە . | ١- ڕێژەی کاربۆن تیایدا لەنێوان ( ٤٥-٦٠٪ ) دایە .<br>٢- مێژووی دروست بوونی دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی جیۆلـۆجی سێیەم .<br>٣- لەو شوێنانەی ئەم جۆرە خەڵووزەی لێیە کارەبای لێ دەردەهێنرێت ، کەرەستەیەکی خاوە بۆ پیشەسازی کیمیاگەری .<br>٤- لە خورهەڵاتی ئەڵمانیا و هەندێ ناوچەی ڕوسیا و خۆرئاوای ولاتە یەکگرتووەکاندا هەیە . |

هۆ/ خەڵووزی ئەنتراسایت چاکترین چەشنی خەڵوزە ؟ و/ خاڵی ١،٢،٣ .

هۆ/ باشیی خەڵوزی لەگنایت لە هەردوو چەشنەکەی تری خەڵوز کەمترە ؟

بۆشایی/ خەڵوز دابەش دەکرێت ( ڕیزدەکرێت ) لەسەر بنچینەی ( بنەڕەتی ) :

هۆ/ نەبەشداربوونی خەڵوزی لەگنایت لە بازرگانی جیهانیدا ؟ و/ خاڵی ١، ٢ .

١- پلەی کۆنی دروست بوونی . ٢- ڕێژەی پێکهاتووەکانی لە کاربۆن و هەڵمی ئاو و ئەو ماددانەی لێی دەردەچن .

هۆ/ هەوڵدانی مرۆڤ بۆ گەڕان بەدوای سەرچاوەی تری ووزە بێجگە لە نەوت و خەڵوز ؟

و/ ① بەهۆی نەبوونی ئەم دوو سەرچاوەیەی ووزە لە هەموو ولاتێکی جیهان .

② نەوت بەو شێوەیە نەمایەوە کە تەنها وەك شلەیەك بۆ ڕووناکی بەکاربهێنرێ ، بەڵکو بووە ماددەیەکی ئابووری و ئیستراتیجی گرنگ .

بۆشایی : ئینگلتەرا ساڵی ١٩٦٩ ز لە ووزەی ئەتوم ٢٨،٥ ملیۆن کیلۆ وات / کاژێر کارەبای بەدەستهێنا.

**گرنگیی خەڵوز وەك کەرەستەیەکی خاوی پیشەسازی :**

١- ماددەیەکی پێویست و بنەڕەتە لە پیشەسازی کانزاییدا بەتایبەتی پیشەسازی ئاسن و پۆڵا .

٢- خەڵوز بەشدار دەبێت لە پیشەسازی ئامۆنیا و بۆیە و دەرمان و پێویستی پزیشکی .

٣- بەشدار دەبێت لە پیشەسازی نایلۆن و لاستیکی دەستکرد .

هۆ/ بوونی خەڵوز بەندە بە ناوچەکانی بەردی نیشتوویی ؟

و/ چونکە خەڵووز کەرەستەیەکی ڕووەکیە لە سروشتدا دروست بووە بەهۆی شی بوونەوەی کیمیایی ئەو دارستان و ڕووەکانەی لەسەر زەوی و لەناو زەلکاوەکاندا پێش ( ١٠٠٠ ) ملیۆن ساڵ هەبوون ، وە پاش ماوەیەکی زۆر ئەم ڕووەکانە کەوتوونەتە ژێر زەویەوە ، پاشان لە ژێر پاڵە پەستۆیەکی زۆر و گەرمیەکی بەرزدا ڕەق بوون .

**بۆشایی/** تا رێژەی کاربۆن لەخەڵوزدا زۆربێت ئەوا : **نرخی زیاتر دەبێت** و **وزەیەکی گەرمی زۆرتر دەدات لەگەرمی** .

**بۆشایی/** **خەڵوزی بەردین** بەسەرچاوەی بنچینەیی دادەنرا بۆئەو ئامێرانەی کەبەهێزی هەڵم کاریان دەکرد لەشۆرشی پیشەسازی دا .

**بۆشایی/** گرنگی خەڵوزی بەردین دەگەرێتەوە بۆدۆزینەوەی ئەو ئامێرانەی بە هەڵم کاریان دەکرد لە ساڵی ١٧٦٤ .

**رێگاکانی دەرهێنانی خەڵوز :** خەڵوز بە یەکێك لەم رێگایانەی خوارەوە لە زەوی دەردەهێنرێت :

١- **رێگای چاڵی کراوە :** ئەمە بە راماڵینی ئەو توێ تەنکە پێکدێت کە بەسەر زەویەکەوەیە و کانە خەڵوزەکەی داپۆشیوە و ، ئامێری هەڵکەندن و راماڵین بۆی بەکاردەهێنرێت ،وەك کانە خەڵوزەکانی ( یۆرکشایەر ) لە ئینگلتەرا و، ویلایەتی ( ئەلینوێ ) لە وڵاتە یەکگرتووەکان ئەمەریکا .

٢- **رێگای چاڵی قووڵ (ئەو کانانەی لە قوڵایی زەویدان) :** هەندێك جار ئەو کانە خەڵوزانە سەدان مەتر لە قوڵایی زەوی دان بۆیە پێویستە ئەو کانانە بە قووڵی هەڵکەنرێن بۆئاوەوە بۆئەوەی بگەنە ئەوکانە خەڵوزانە.ئەم رێگایە لەکانەکانی باشووری ( وێڵز ) لە ئینگلتەرا و ، ویلایەتی ( پەنسلڤانیا ) لە وڵاتە یەکگرتووەکان ئەمەریکادا بەکاردەهێنرێت .

٣- **رێگای تونێل :** زۆربەی کانە خەڵوزەکان لە جیهاندا دەکەونە لاپاڵی زنجیرە چیاکان و بانە کۆنەکان و لە هەندێ لەو ناوچانەدا ئەو چینە دەمارە خەڵوزانە ئەستوورن و بە شێوەیەکی ئاسۆیی دەردەکەون بۆیە لەم رێگایەدا تونێل بەکاردێت بۆ برینی ئەو چینە دەمارە خەڵوزانە وەك لە کانەکانی ویلایەتی ( پەنسلڤانیای رۆژئاوا ) و ویلایەتی (ڤەرجینیای رۆژئاوا ) لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

**هۆ/ گەلێك هۆ هەن کاردەکەنە سەر بەرهەم هێنانی خەڵوز ؟**

١- هەندێکیان پەیوەندیان بە بواری بەکارهێنان و قەبارەی بەکاربردنیەوە هەیە .

٢- هەندێکی تریش پەیوەندی بە بارودۆخی رامیاریەوە هەیە .

**دابەش بوونی جوگرافی خەڵوز لە چین : بە پلەی یەکەم دێت لەجیهاندا لەبەرهەمهێناندا ،وگرنگترین کانە خەڵوزەکانی دەکەونە :**

١- ناوچەی مەنشوریا لەوپەری باکووری چین .

٢- کانەکانی هۆبی و شانسی لە باکوور .

٣- کانەکانی زەچوان لە ناوەند و باشوور .

**هۆ/شێوەی بەکاربردنی خەڵوزلەوڵاتە یەکگرتووەکان وەك هەمان شێوەی رژێمی رامیاری وایە وبایەخ نادەنە پاراستنی سامانی خەڵوز؟**

و/ چونکە کۆمپانیا سەرمایەدارەکان دەری دەهێنن ، ئەوانیش مەبەستیان تەنیا قازانجی زۆرە و هەر چەشنە باشەکان و چینە ئەستوورەکان دەردەهێنن .

**دابەش بوونی جوگرافی خەڵوز لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا :**

١- کانە خەڵوزەکانی ئەپلاشیان لە خۆرهەڵاتی وڵاتە یەکگرتووەکان،کە گەلێك خاسیەتی چاکی ئابووری وسروشتیان تێدایە ؟

چونکە دەماری خەڵوزەکان لە زەویەوە نزیکن .و ٦٨٪ ی خەڵوزی ئەنثراسایتی هەموو جیهانی لێ بەرهەم دەهێنرێت.

٢- کانەکانی ناوەوە ، کە دەکەونە رۆژئاوای چیاکانی ئەپلاشیان .

٣- کانەکانی چیای رۆکی و کەنارەکانی زەریای هێمن .

٤- کانەکانی ویلایەتی (واشنتۆن) و (داکوتای باکوور) و (داکوتای باشوور) کە زۆر بەکار ناهێنرێن ؟

چونکە ناتوانن بەربەرەکانی چەشنە باشەکانی خەڵوزی کانەکانی تر بکەن .

**دابەش بوونی جوگرافی خەڵوز لە روسیای فیدراڵ :**

١- حەوزی کۆزنتسك : گرنگترین کانەکانی ( کزباس ) ە لە خۆرهەڵاتی روسیا ،کە بە ناوچەی یەدەگی خەڵوز دادەنرێت .

٢- کانەکانی ناوچەی تۆلا و حەوزی مۆسکۆ و چیای ئۆرال لە خۆرئاوای روسیا ،کەبەناوچەی بەرهەمهێنانی خەڵوز دادەنرێت.

**دابەش بوونی جوگرافی خەڵوز لە ئۆکرانیا :**

**دۆنباس :** گرنگترین کانەکانی بەرهەم هێنانی خەڵووزە لە حەوزی دۆنتز کە دەکەوێتە سەرووی دەریای رەش و خوارووی ئۆکرانیا و ، ئەوەی بایەخی ئەم کانانەی زیاد کردووە ئەوەیە کە دەکەونە نزیك کانەکانی ئاسن لە ( کریڤۆری رۆج ) .

**دابەش بوونی جوگرافی خەڵوز لە ئینگلتەرا ( بەریتانیا ) :بەیەکەم وڵاتی ئەوروپا دەژمێردرێت لەبەرهەمهێنانی خەڵوز:**

١- یۆرکشایەر :بەگرنگترین ناوچەی خەڵوز دادەنرێت لە ئینگلتەرا (بەریتانیا ) چ لە ڕووی بەرهەم هێنان و چ لە ڕووی یەدەگەوە ، دەکەوێتە بەشی خۆرهەڵاتی چیاکانی پەنانینز .

٢- سکۆتلەندا .

٣- وێلز .

٤- ئایرلەندای باکوور .

**هۆ و بۆشایی/کەم بوونەوەی بەرهەمی ئینگلتەرا ( بەریتانیا ) لە خەڵووز دوای جەنگی جیهانی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ :**

١- لەبەر بێ بازاڕی دەرەوە .

٢- کۆنیی هۆیەکانی بەرهەم هێنان .

٣- ئینگلتەرا ( بەریتانیا ) پێش وڵاتانی جیهان بەرهەمی لە کانە خەڵووزەکان دەرهێنا .

**دابەش بوونی خەڵووز لە دوورگەکانی بەریتانیا گەلێک خاسیەتی هەیە ، لەوانە :**

١- ناوچەکانی خەڵوز دەکەونە نزیک کەنار دەریاکان یان نزیک هێڵە ئاسنینەکانەوە ،ئەمەش وای لێدەکات بە ئاسانی بگوازرێتەوە .

٢- باشیی جۆری خەڵوزەکەی .

٣- نزیکی لە کانەکانی ئاسنەوە .

**گرنگترین ئەو کۆسپە ئابووریانەی دێنە ڕێی بەرهەم هێنانی خەڵوز لە ئینگلتەرا ( بەریتانیا ) :**

١- ڕژێمی بەکارهێنانی کانەکان . ٢- ڕۆژانەی کرێکار . ٣- تەنکیی دەمارە خەڵووەکان و دووریان لە ڕووی زەویەوە .

سیلیزیای سەروو : گرنگترین ناوچەی بەرهەمهێنانی خەڵووزە لە پۆڵەندە لەسەر سنووری ئەڵمانیا و چیک ، خەڵوزی ئەم ناوچەیە بە باشی و زۆریی بڕەکەی و باری دەرهێنانی گونجاو بەناوبانگە .

**دابەش بوونی جوگرافی خەڵووز لە ئەڵمانیای یەکگرتوو :**

١- حەوزی ڕۆر : گرنگترین کانەکانی خەڵوزە لە ئەڵمانیای یەکگرتوو کە دەکەوێتە خۆرئاوای وڵات و بە مەڵبەندیکی گەورەی کۆبوونەوەی پیشەسازی و دانیشتوان دەژمێردرێت و پیشەسازی ئاسن و پۆڵا لە ناوچەکەدا پشتی پێ دەبەستێ .

٢- هەرێمی سار : بە دووەم ناوچەی کانەکانی خەڵوز لە ئەڵمانیای یەکگرتوو دەژمێردرێت ، کە سەرچاوەی ئەسرەوتی و پشێوی بوو لەنێوان فەرەنسا و ئەڵمانیا ، تا لە ساڵی ( ١٩٥٧ ) خرایە سەر ئەڵمانیا .

٣- کانی ئەکسی لاشاپیل : لەسەر سنووری بەلجیکا و هۆڵەندە ، و کانی ( وستڤالیا ) .

بۆشایی / هەژارترین قارە لە خەڵوزدا ئەمانەن : ئەمەریکای باشوور و ئەفریقیا .

**هۆ/ کەمیی چالاکی بازرگانی خەڵووز ؟**

١- سروشتی خەڵووز وایە کە بە ئاسانی ناگوێزرێتەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر چونکە قورسە و قەبارەی گەورەیە و گواستنەوەی زۆری تێدەچێت .

٢- هەندێ دەوڵەتی پیشەسازی پەنا دەبەنە بەر سەرچاوەی تری ووزە وەک نەوت و دەرهێنانی کارەبا لە تاڤگەی ئاو ، وەک ئیتالیا و ژاپۆن و ... هتد .

**هۆ/ زۆر لەو دەوڵەتانەی خەڵووز دێنرنە دەرەوە لە هەمان کاتدا هەندێک لە دەرەوە دەهێنن وەک فەرەنسا و ئەڵمانیا و بەلجیکا ؟**

چونکە پێویستیان بە خەڵووزی کوک هەیە کە بۆ پیشەسازی ئاسن و پۆڵا پێویستە و بەکاردەهێنرێت .

بۆشایی /گەورەترین دەوڵەتە لەناردنە دەرەوەی خەڵوز لەجیهاندا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

بۆشایی / بەشداری کردنی خەڵوز لەبازرگانی نێوان دەوڵەتاندا لە ٥ – ٧٪ تێپەڕناکات،

وریژەی نەوت لەبازرگانی نێوان دەوڵەتان لە ٣٠ ٪ زیاترە .

**نەوت**:سووتەمەنیەکی شلە لەناوجەرگەی زەوی دەردەهێنرێت.هەندێك لەزاناکان دروست بوونی نەوت دەگەڕێننەوە سەربنچینەی ئەندامی وهەندێکی تریان دەیگەڕێننەوە سەربنچینەی نائەندامی.بەڵام ڕای پەسەند وبڵاو ئەوەیە کەدروست بوونی نەوت دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕووەك وزیندەوەرانەی لە ناوە گەرمەکاندا کە ملیۆنەها ساڵ لەمەوبەر دەژیان و ماونەتەوە و بوون بە ژێر نیشتەییەوە لە بنی دەریا وزەریاکاندا ودووچاری پاڵە پەستۆی زۆر وگەرمی بەرز هاتوون وئەو مادادنە گۆڕاون بۆ ناوێتەیەکی هایدرۆکاربۆنی وبە کارتێکردنی جۆرەها بەکتریای ناهەوایی کۆن.ئەو ماددە ئەندامیانە گۆڕاون بۆ ماددەیەکی شل لە نەوت و گاز وئاو .

**پ/لەسەردەمە کۆنەکانەوە مرۆڤ نەوتی ناسیوە و بۆگەلێ مەبەست بەکاری هێناوە، ئەمە روون بکەوە.**

**وەڵام/** ڤیرِ یەکێکە لەبەرووبومی نەوت کە میسریە کۆنەکان بەکاریان هێناوە بۆ مۆمیاکردنی لاشەی مردووەکانیان.وەبابلیەکان وئاشووریەکان بەکاریان هێناوە بۆ خانوو ، وهەروەها هیندیە سوورەکان ودانیشتوانی میا نمار( بۆرما ) ناسیویانە.

**حەشارگەکانی نەوت** : بریتیە لە ناوچەکانی کۆبوونەوەی نەوت ، بۆ دروست بوونی نەوتیش مەرجە کە بەردی نیشتووی پڕ لە کونی وورد هەبێت لە نێوان دوو چینی بەردی بێ کوندا لە سەر و ژێریدا .

**گرنگیی نەوت لەم سەرچاوانەوە دێت :**

١- بە سەرچاوەیەکی بنچینەیی ووزە دادەنرێت .

٢- وەك کەرەستەیەکی خاو بەشدار دەبێت لە پیشەسازیە کیمیایی و پترۆکیمیاوی.

٣- بەشدار دەبێت لە پیشەسازی خۆراك بەوەی کە سەرچاوەیەکی پرۆتینە .

**خاسیەتەکانی نەوت :**

١- دەرهێنان و گواستنەوە و عەمارکردنی ئاسانە .

٢- لەچاو سەرچاوەکانی تری ووزەدا ، ووزەی ( نرخی ) گەرمی بەرزترە ، بۆ نموونە ووزەی گەرمیی کێشێکی نەوت لە ووزەی هەمان کێشی خەڵووز زیاترە .

٣- دەتوانرێت بە پاڵاوتنی بەش بەش بکرێت و پێکهاتووی زۆری جۆربەجۆری بەسوودی وەك بەنزین و نەوتی سپی و ڕۆنی چەورکردن و گریسی لێ دروست بکرێت .

**بۆشایی/** گەورەترین شت نەوت پێشکەشی کردبێت بە مرۆڤ بریتیە لە <u>ڕۆنی چەورکردن</u> .

**کاریگەری نەوت لەسەر دەوڵەتانی بەرهەم هێن و بەکاربەر لە ڕووی :**

١- **ڕامیاری** : بەربەرەکانێی خستە نێوان دەوڵەتە سەرمایەدارە گەورەکانەوە بۆ دابین کردنی پێویستیان لە نەوت و بەردەوام بە لێشاو بگاتە ناوچەکانیان بە نرخێکی هەرزان ، هۆیەکەشی ئەوەیە کەنەوت کەرەستەیەکی ستراتیژی پێویستە بۆ پیشەسازی و کاروباری سوپا.ئەم دووبەرەکیە پاڵی بە دەوڵەتانەوە نا بۆ پێکەوە نانی ( کارتێل )ێکی جیهانی بۆ دەست بەسەردا گرتنی نەوت .

٢- **کۆمەڵایەتی** : نەوت گۆڕانێکی هێنایە کایەوە لە ژیانی دەوڵەتانی بەرهەم هێندا و ، ئەو بیابانەی نەوتی لێ دەرهێنرا گۆڕا بۆ ناوچەی جێگیربوونی دانیشتوان،و ژیانی کۆچبەر ( بەدو ) انی گۆڕی بۆ ژیانی نیشتەجێ بوون ، وەك لە کوێت و لیبیا وسعودیە .

٣- **ئابووری** : نەوت بوو بە سەرچاوەیەکی سەرەکی دەستکەوتی( داهاتی ) نەتەوەیی لە دەوڵەتە بەرهەم هێنەکاندا ، بەتایبەتی ئەو دەوڵەتانەی کە نەوت کەرەستەی سەرەکی ناردنە دەرەوەیانە وەك هەندێ وڵاتانی عەرەب کە ڕێژەی دەستکەوتی نەوت زیاتر لە ٩٥٪ پێك دەهێنێت (ئیمارات و سعودیە و کوێت و لیبیا .... )

**دابەش بوونی جوگرافی نەوت لە ڕوسیای فیدراڵ :**

١- **باکۆی دووەم** : بریتیە لەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە نێوان ڕووباری ڤۆلگا و چیای ئۆراڵ کە پێی دەوترێت ( ڤۆلگا ـ ئۆراڵ ) ، کە بە گرنگترین ناوچەی بەرهەم هێنان دادەنرێت لە ڕوسیا و گەورەترین یەدەگی نەوتی وڵاتی تێدایە .

٢- ناوچەی باکووری دوورگەی سەخالین.بەدووەم ناوچە دادەنرێت لەڕووی یەدەگەوە لەکیشوەری ئاسیا دوای ناوچەی کەنداوی عەرەبی.

٣- باکوور و باشووری چیای قەوقاز .

**دابەش بوونی جوگرافی نەوت لە ئازەربایجان :**

کەناری رۆژئاوای دەریای قەزوین نزیک باکۆ .

**باطوم :** بەندەرێکی ( جۆرجیا )یە لەسەر دەریای رەش کە نەوتی ( کەناری رۆژئاوای دەریای قەزوین نزیک باکۆ )ی ئازەربایجان )ی بەهۆی بۆریەوە ( لوولە ) بۆ دێت ولەوێشەوە نەوتەکە بەهۆی کەشتیەوە دەگوازرێتەوە بۆ دەوڵەتانی سەرووی ئەوروپا .

**هۆ/ دەست بەسەردا گرتنی نەوت لە زۆربەی ناوچەکانی جیهان ، لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکان ، بەرەو کشانەوە رۆیشت ؟**

و/ بەهۆی ووریابوونەوەی گەلان و خەباتیان لە پێناوی سەربەخۆیی ئابووری و سەربەستیاندا .

**دابەش بوونی جوگرافی نەوت لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا :**

١- کانەکانی چیای ئەپلاشیان لە خۆرهەڵات و باکووری خۆرهەڵات گرنگترین کانە نەوتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان بوون ؟

چونکە کەوتوونەتە ناوچەیەکی پیشەسازی و دانیشتوانیشی زۆرە .

**هۆ/ بایەخی کانە نەوتەکانی چیای ئەپلاشیان روو لە کەمیە ؟**

چونکە بەرهەم هێنانەکەی نوێیە و هەر هەمووشی لە ناوخۆ ، یاخود لە کەنارەکانی خۆرهەڵاتیدا بەکاردێت .

٢- کانەکانی ویلایەتەکانی ناوەند ، کە لە خۆرئاوای رووباری مسیسپی و باشووری رووباری میسۆری لە ویلایەتی کەنساس لە باکوورەوە درێژ دەبێتەوە بۆ ویلایەتی لویزیانا لە باشوور ، ونزیکەی ٦٠ ٪ ی تێکرای نەوتی ولاتە یەکگرتوەکان بەرهەم دێنێت.

٣- کانە نەوتەکانی ئۆهایۆ ( لیما ) و میشیگان و ئەلینویْ .

٤- کانەکانی کەناری کەنداوی مەکسیك، لەناورێژگەی رووباری مسیسپی نزیك بەندەری نیوئۆرلیانز درێژدەبێتەوە تاکو سنووری مەکسیك.

٥- کانەکانی چیای رۆکی و کالیفۆرنیا و ئالاسکا کە بەرهەمی گەیشتۆتە (١٠ ٪ ) ی سەرجەمی بەرهەمی ووڵات .

**دابەش بوونی جوگرافی نەوت لە ئێران :**

١- کانەنەوتەکانی هەرێمی ئەحواز ( ئەهواز ) نزیك کەنداو، وەك کانەکانی ( مسجد سليمان، پازنان، نەفت سفيد، لالی ) . نەوتی ئەم ناوچەیە بەهۆی لولە دەبرێت بۆ دورگەی خەرج لەکەنداو لەوێشەوە دەنێردرێت بۆ بازارەکانی جیهان.

٢- نەوتخانەی کرماشان و نەفت شا .

**دابەش بوونی جوگرافی نەوت لە ڤەنزوێلا :**

١- مەراکیبۆ : گرنگترین کانە نەوتەکانی ڤەنزوێلایە کە دەکەوێتە ئەوپەڕی باکووری ئەمەریکای باشوور لەسەر کەناری دەریای کاریبی ، هەروەها نەوت لە ژێر ئاوی کەنداوی ( مەراکیبۆ )شدا هەیە . ئەم کانانە بەهۆی بۆری ( لوولە )وە بەستراون بە بەندەری سان لۆرنزۆ کە کارگەی پاڵاوتنی نەوتی لێیە .

٢- بەشی خۆرهەڵاتی دەلتای رووباری ئۆرینۆکۆ بەرامبەر دوورگەی ترینیداد .

**هۆ/ نەوتی ڤەنزوێلا بە ئاسانی دەنێردرێتە دەرەوە ؟** بەهۆی نزیکیی شوێنی ناوچەکانی بەرهەم هێنانی نەوت لە کەنارەکانەوە .

**بۆشایی** / زۆربەی نەوتی ڤەنزوێلا دەنێردرا بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەبەرئەوەی دەستی گرتبوو بەسەردەرهێنان و پاڵاوتنی نەوتەکەی.

**هۆ/ ناتوانین بە ئاسانی بڕی ئەو نەوتەی لە ناوجەرگەی زەویدایە ، بخەملێنین ؟**

چونکە ئەم خەملاندنە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەگۆڕێت لەبەرچەند هۆیەك،هەندێکیان پەیوەندیان بە رێگاکانی گەڕان و پشکنین ، هەندێکی تریشیان پەیوەندیان بە پێشکەوتنی زانستیەوە هەیە کە یارمەتی دۆزینەوەی کێڵگەی نویْ دەدات کە لەوەوپێش نەزانرا بوون .

**بۆشایی** / وڵاتانی عەرەبی بە پێی خەملاندنی ساڵی ١٩٩٦ لە ٥٦٪ ی پاشەکەوتی نەوتی جیهانی هەیە.

**بۆشایی**/ وڵاتی سعودیە بە پلەی یەکەم دێت لە پاشەکەوتی نەوتی عەرەبی و عێراق بە پلەی دووەم دێت .

**هۆ/ ئێستا مەترسیی ووشك بوونی بەم زووانەی نەوت کەمتر بۆتەوە ؟**

چونکە هەموو ساڵێك کان ( کێڵگە ) و حەشارگەی تری تازەی نەوت لە ناوچەکانی جیهان دەدۆزرێتەوە کە ئەمانەش یەدەگێکی ئەوەندە زۆری تێدایە بە قەدەر بەکاربردنی ساڵانەی هەموو جیهان .

هۆ/ پەیدابوونی جوڵانەوەی بازرگانی نەوت لە نێوان دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان ودەوڵەتە پێشکەوتووەکان ؟

و/ ① دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان بڕێکی زۆر نەوت بەرهەم دەهێنن کە لە بەکاربردنی ناوخۆیان زیاترە .

② دەوڵەتە پێشکەوتووەکانیش بڕێکی کەم دێننە بەرهەم کە بەشی پێویستی خۆیان ناکات و ناچارن لە دەرەوە بیهێنن .

بۆشایی/ئەو دەوڵەتانەی کە نەوت دەنێرنە دەرەوە لە جیهاندا ، لە سێ ناوچەی سەرەکی جیهاندان :

١- دەوڵەتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست (٣٨٪).

٢- باکووری ئەمەریکای باشوور و دەریای کاریبی(١٣٪) .

٣- ئەفریقیا ( بە میسر و لیبیا و جەزائیریشەوە ) (١٤٪).

هۆ/ بۆری ( لوولە ) و پاپۆڕ زۆر جار تەواوکەری یەکترن لە بازرگانی جیهانی نەوت ؟

چونکە لە کانەکانەوە بەهۆی بۆری ( لوولە ) نەوت دەگاتە ڕۆخی دەریا و زەریاکان لەوێشەوە نەوتەکە بەهۆی پاپۆڕی گەورەوە باردەکرێت بۆ ناوچەی بەکاربردنی .

بۆشایی/ لوولە هەرزانترین هۆی گواستنەوەی نەوتە لە جیهاندا.

بۆشایی / زۆربەی نەوتی عەرەب بەهۆی لوولە دەنێردرێتە دەرەوە .

بۆشایی / گواستنەوەی نەوت بەهۆی لولە سەرمایەکی زۆری دەوێت، بەڵام لەڕووی ئابووریەوە پارەودەرامەتێکی زۆر بۆ وڵات گلْ دەداتەوە.

هۆ/ گواستنەوەی نەوت بەهۆی کەشتی نەوت هەڵگرەوە جیایە لە گواستنەوە بەهۆی لوولەوە ؟

چونکە دەتوانرێت لەناکاودا ڕووی گواستنەوەکەی بگۆردرێت و بە ئاسانیش بیدات بە دەستەوە .

هۆ/ گواستنەوەی نەوت بەهۆی ئوتومبێل و شەمەندەفەرەوە کەمتر بەکاردەهێنرێت و زۆر ئابووریانەش نیە ؟

و/ بەهۆی ئەوەی زۆری تێدەچێت و کەمیش دەتوانرێت باربکرێت و گواستنەوەشی مەترسی تێدایە .

ماوەی تەواوبوونی نەوت : بە دابەشکردنی بڕی پاشەکەوت بەسەربڕی بەرهەم دەپێورێت وبەیەکەیەکی پێوەری چونیەك.

گرنگترین ڕێگاکانی کە هەندێ وڵات پەیڕەوی دەکەن بۆ ئەوەی کاتی تەواو بوونی نەوتەکەیان دوا بخەن :

١- زیاد کردنی بڕی ئەو نەوتەی بەرهەمی دێنن لە ڕێی چاککردنی هەردوو کرداری بەرهەم هێنان و پاڵاوتن .

٢- دڵۆپاندنی نەوت لە بەردی ( الطفل الزيتي ) یا ( السجيل ) .

٣- بەکارخستنی سەرچاوەکانی زووی ووزە بە شێوەیەکی فراوانتر وەکو سەرچاوەی خەڵووز و گازی سروشتی .

٤- دەست بەسەردا گرتنی ووزە وە دەگرن و کەمی دەخەنە کار و بەفیڕۆی نادەن .

بۆشایی/بە پلەی یەکەم و دووەم دێن لەڕووی توانای دەرهێنان و بەرهەمهێنانی نەوت وڵاتانی عەرەب و وڵاتە یەکگرتووەکان.

دابەش بوونی جوگرافی نەوت لە عێراق :

١- کانەکانی هەرێمی کوردستان:کانەکانی پارێزگای کەرکوك بریتین لە بیرەکانی بابەگوڕگوڕ و چەمەبۆر و بای حەسەن.کانەکانی پارێزگای نەینەوابریتین لەبیرەکانی عەین زالەوبە تمە و لە خانەقین نەفتخانە. لەسەردەمی حکومەتی هەرێمی کوردستانیش چەندین کانی نەوتی تر خراونەتە کار وەك کانەکانی شیواشۆك لە پارێزگای هەولێر.کانەکانی تاوکێ (زاخۆ) لە پارێزگای دهۆك.

٢- کانەکانی باشوور : کانەکانی پارێزگای بەسرە بریتین لە بیرەکانی ڕومێلە و زوبێر و نەرطاوي و اللحيس و نەهرانی عومەر ، کانەکانی پارێزگای میسان بریتین لە بیرەکانی ئەبوغراب و فەککە و بەزرگان ومەجنون .

**بۆشایی /** لەکیشوەری ئەمریکای باکور بەناوبانگترین تاڤگەی تێدایە لەجیهان کەبریتیەلە نیاگارا .

**هۆ/ لە کیشوەری ئەمەریکای باشووردا ، ناوچەی هێزی ئاو زۆرە بەتایبەتی لە بەرازیل ؟**

و/ چونکە رووباری ئەمەزۆن و لقەکانی تێدایە کە لە چیاکانی ئەندیز هەڵدەقوڵێن لە خۆرئاوای قارەکە .

**هۆ/ دەتوانین بڵێین بازرگانی کارەبا لە جیهاندا یان نیە یانیش زۆر کەمە ؟**

و/ ① گواستنەوەی تەزووی کارەبا بۆناوچەی دووریەهۆی تەلەوە بۆ ماوەی هەزار میل زیاتر دەبێتە هۆی بزربوونی تەزووی کارەباکە ، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستی بە گۆڕەر ( محولة ) هەیە کە ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی تێچوونی .

② ئەو دەوڵەتانەی کارەبا بەرهەم دەهێنن ، زۆربەی کارەباکە بۆ جێبەجێ کردنی پێویستی ناوخۆ بەکار دەهێننەوە .

**گرنگترین ئەو وڵاتانەی کارەبای کارۆئاوی بەرهەم دەهێنن :**

١- وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا : ( ٢٥٪ )ی ووزەی کارەبای جیهان بەرهەم دێنێت لەسەر رووباری کۆلۆرادۆ و رووباری کۆلۆمبیا و لای تاڤگەکانی نیاگارا و حەوزی تەنسی و چیاکانی ئەپلاشیان .

٢- کەنەدا : ( ١٥٪ )ی ووزەی کارەبای جیهان بەرهەم دێنێت ، لە گرنگترین مەڵبەندەکانی ( کیمانۆ ) لە کۆلۆمبیای بەریتانی ، هەروەها بە هاوبەشی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تاڤگەکانی نیاگارا و رووباری سانت لۆرنس بەکاردێنن .

٣- ژاپۆن : **ژاپۆن لە ( ١٠٪ )ی ووزەی کارەبای جیهان بەرهەم دێنێت ؟**

چونکە ژاپۆن لەو وڵاتانەیە کە سروشت رووباری تیژڕەو و بارانی زۆر و رووی زەوی جیاوازی پێ بەخشیوە و ، بۆتە هۆی ئەوەی کەم و کووڕی سەرچاوەکانی تری ووزەی وەك نەوت و خەڵووز پڕبکاتەوە .

**هۆ/ زیادبوونی خواستی جیهان لەسەر گازی سروشتی بە شێوەیەکی نێجگار گەورە ؟**

**هۆ/ دەرکەوتنی پایەی گازی سروشتی کە وای لێهات بەربەرەکانی بەهێزی سەرچاوەکانی تری ووزە بکات ؟**

و/ ① سەرچاوەیەکی گرنگە لە سەرچاوەکانی سووتەمەنی کە ووزەیەکی گەرمایی زۆر دەدات .

② بۆ بەکارهێنان پاك و تەمیزە و بە ئاسانیش دەردەهێنرێت .

③ بە ماددەیەکی بنەڕەتیش دادەنرێت لە پیشەسازی پترۆکیمیاوی و پەیین‌دا .

**گرنگترین ئەو بوارانەی کە گازی سروشتی تیایدا بەکاردێت :**

١- بۆ بەکارهێنانی ناوماڵ ، بە باشترین جۆری سووتەمەنی دادەنرێت ، بەزۆریش بەکاردێت بۆ خۆراك لێنان و ساردکردنەوە و گەرم کردنەوە ، لە کاتی کارکردنیشدا هیچ جۆرە خڵتەیەك بەجێ ناهێڵێت و بە ئاسانی بەکاردێت و دەستی بەسەردا دەگیرێت .

٢- لە بواری پیشەسازیدا بەربەرەکانی خەڵووز و نەوت دەکات بۆ بەکارهێنان وەك سووتەمەنیەکی بە کەڵك ؟

چونکە توانای زیادکردنی بەرهەمداری کووره زیاد دەکات ، ئەمەش وای لێ کرد بەشدار بێت لە دەرهێنانی ووزەی کارەبادا ، و هەروەها لە پیشەسازی کانزا و پاڵاوتن و کاغەز و چیمەنتۆ .

**دابەش بوونی جوگرافی گازی سروشتی لە جیهاندا :**

① ڕوسیای فیدراڵ . ② ئێران . ③ قەتەر . ④ ئیمارات . ⑤ جەزائیر . ⑥ عێراق ( لە پارێزگای کەرکوك ) .

**هۆ/ بڵاوبوونەوەی بەکارهێنان و گواستنەوەی گازی سروشتی بۆ ناوچە دوورەکانی گۆی زەوی ؟**

بەهۆی ئەو ئامرازە نوێیانەی کە بەکاردێن لە گۆڕینی گاز بۆ شلە و، پاشان گواستنەوەی گازەکە بە شلیی بەهۆی لوولە یا پاپۆڕەوە .

**هۆ/ بەکارهێنانی ووزەی خۆر لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندا ، زۆر کەمە ؟**

و/ ① پێویستی بە سەرمایەی زۆر هەیە .

② دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان ئێستا پێویستیان بە ووزەی خۆر نیە .

**بۆشایی /** بڕی تیشکدانەوەی خۆر کە پێویستی جیهان پڕبکاتەوە بۆ مەبەستی بەرهەمهێنانی ووزە لەتێکڕای ئەو ووزەیەی لە خۆرەوە دێت بریتیە لە ٠.٠١٪ .

**یۆرانیۆم** : ئەو کانزایەیە کە ووزەی زەرەی لێ پەیدا دەکرێت ، ئەو ووزە گەرمایەی کە یەک کیلۆگرام خەڵووز دەیدات دەگاتە ٨٠٠ کیلۆ سوعرەی گەرمی ، بەڵام ئەو ووزەیەی کە لە تێکدان وێران کردنی یەک کیلۆگرام یۆرانیۆم پەیدا دەبێت ٢.٥ ملیۆن جار زیاترە .

هەر بۆیەشە ووزەی زەرە بایەخێکی گەورەی پێدراوە لەلایەن دەوڵەتە گەورەکان .

**بۆشایی** / وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و روسیا و ئۆکرانیا ١٠٪ و ژاپۆن وبەریتانیا ٩٪ ی ووزەی زەرە( ووزەی ئەتۆمی ) یان هەیە .

**ئەو کۆسپە هونەری و ئابووریانەی کە تووشی بەرهەم هێنانی ووزەی زەرە دەبن :**

١- بە پیت کردنی یۆرانیۆم پارەی زۆری تێدەچێت .

٢- بە ئاسانیش خڵتەکەی لەناو ناچێت .

٣- دەبێ بەربەستی ئەوەش بکرێ کە تیشکی زەرەکە نەچێتە دەرەوە چونکە دەبێتە هۆی پیس کردنی ژینگە .

**گرنگترین کانەکانی یۆرانیۆم لە جیهاندا :**

١- رووباری مەکەنزی لە کەنەدا .

٢- رووباری کۆلۆرادۆ لە وڵاتە یەکگرتووەکان .

٣- سەرووی سیبیریا لە روسیا .

٤- هەرێمی شابا لە زائیر ( کۆنگۆی دیموکراتی ).

٥- میسر .

**هەرێمی شابا** :ئەو هەرێمەیە کەدەکەوێتە باشوری زائیر( کۆنگۆی دیموکراتی ) وبەکانەکانی یۆرانیۆم بەناوبانگەو کانەکانی مس لە ( زامبیا ) ش درێژدەبێتەوە بۆئەم هەرێمە،ماوەیەکی زۆریش کانزای ئەم هەرێمە ودەرنەدەهێنرا بەهۆی دوورییەوە لەکەناردەریاوە.

# هەڵبژاردنەکانی بەشی چوارەم /سەرچاوەکانی ووزە

١. خەڵووزی : ( بتیۆمین – ئەنثراسایت – لەگنایت – کوک ) بەشداری لە بازرگانی جیهانی دا ناکات.
٢. هەرزانترین هۆی گواستنەوەی نەوتە لە جیهاندا : ( ئۆتۆمبیل – شەمەندەفەر – لوولە – کەشتی ).
٣. کانی سیلیزیای سەروو لە گرنگترین ناوچەکانی بەرهەمهێنانی خەڵووزە لە وڵاتی :
( بەریتانیا – روسیا – پۆڵەندە – ئۆکرانیا ).
٤. هەژارترین کیشوەرە لە بوونی خەڵوز: ( ئەوروپا – ئەفریقیا – ئاسیا – ئوسترالیا ).
٥. گرنگترین ناوچەی بەرهەمهێنانی خەڵووز لە ئەڵمانیا : ( سیلیزیای سەروو – کزباس – رۆر – دۆنتز ).
٦. لەکیشوەری ئەمریکای باکور بەناوبانگترین تاڤگەی تێدایە لەجیهان کەبریتیەلە :
( ڤیکتۆریا – میسیسپی – نیاگارا – براهما پۆترا ).
٧. لە گرنگترین کانە خەڵووزەکانی چین: ( کزباس – دۆنباس – تۆلا – زەچوان ).
٨. لەهەموو کیشوەرەکان لەبارترە بۆ پەیداکردنی ووزەی کارۆئاوی :
( ئاسیا – ئەوروپا – ئەمریکای باشور – ئەفریقیا ).
٩. تاڤگەی نیاگارا دەکەوێتە کیشوەری : ( ئەفریقیا – ئاسیا – ئەمریکای باکور – ئەمریکای باشور ).
١٠. یەکەم وڵاتی ئەوروپی لە بەرهەمهێنانی خەڵووز بریتیە لە : ( پۆڵەندە – بەریتانیا - ئەڵمانیا – فەرەنسا ).
١١. گرنگترین کانەکانی بەرهەمهێنانی خەڵووز لە ئۆکرانیا بریتیە لە :
( کزباس – سار – دۆنباس – وستڤالیا ).
١٢. لە قارەی ئەمەریکای باشوور، ناوچەی هێزی ئاوی زۆری تێدایە بەتایبەتی لە وڵاتی :
( ئەرجەنتین – کۆڵۆمبیا – بەرازیل – پیرۆ ).
١٣. رێگەی چاڵی قووڵ بەکاردەهێنرێت بۆ دەرهێنانی ئەو خەڵووزەی کە دەکەوێتە :
( سەرزەوی – نزیک زەوی – بەسەدان مەتر لەقوڵایی زەوی دان – لاکانی زنجیرە چیاکان ).
١٤. کێڵگەی نەوتی باباگورگور دەکەوێتە پارێزگای : ( دهۆک – سلێمانی – کەرکوک – هەولێر ).
١٥. خەڵووزی لەگنایت بەشداری بازرگانی جیهان ناکات چونکە رێژەی کاربۆن تیایدا لەنێوان :
( ٤٥-٦٠ ، ٧٠-٩٠ ، ٣٠-٤٥ ، زیاتر لە ٩٠ ).
١٦. یەکەم دەوڵەتە لە بەرهەمهێنانی خەڵووز لە جیهاندا و ( ١٥ ٪ ) ی یەدەگی جیهان پێکدێنێ :
( چین – بەریتانیا – وڵاتە یەکگرتووەکان – روسیای فیدراڵ ).
١٧. بەیەکەم دەوڵەتی ئەورپا دەژمێردرێت و پێنجەم دەوڵەتە لە بەرهەمهێنانی خەڵووز لە جیهاندا :
( بەریتانیا – ئەڵمانیا – ئۆکرانیا – پۆڵەندە ).
١٨. گەورەترین شت نەوت پێشکەشی کردبێت بە مرۆڤ بریتیە لە :
( بەنزین – رۆنی چەورکردن – ئەسفلت – قیر ) .
١٩. نەوتی کانەکانی کۆماری ئازربایجان لە رێگەی بۆرییەوە دەگوازرێتەوە بۆ بەندەری :
( بیرا – ئارڤێك – باطۆم – باکۆ ).
٢٠. گرنگی خەڵووزی بەردین دەگەرێتەوە بۆ دۆزینەوەی ئەو ئامێرانەی بەهەڵم کاریان دەکرد لەساڵی :
( ١٧٨٨- ١٨٨٤- ١٧٦٠- ١٧٦٤ ).
٢١. ئەو رێگەی کەمتر بەکاردەهێنرێ بۆ گواستنەوەی نەوت ولەرووی ئابوورییەوە زۆر سوودی نییە :
( کەشتی –لوولە –ئۆتۆمبیل –فرۆکە ).

٢٢. تاڤگەی ڤیکتۆریا لەسەر ڕووباری زەمبیزی دەکەوێتە کیشوەری :
(ئەفریقیا – ئەمریکای باشور – ئاسیا – ئەمریکای باکور).
٢٣. لە گرنگترین کانەکانی نەوتی پارێزگای میسان لە عێراق : (رومێلە – عەین زالە – ئەهرانی عومەر – ئەبو غراب).
٢٤. ئەو دەوڵەتەی بە پلەی دووەم دێت لەبەرهەمهێنانی خەڵووز لە جیهاندا :
(ولاتە یەکگرتووەکان – چین – ئۆکرانیا – بەریتانیا).
٢٥. لە گرنگترین کانەکانی نەوت لە ولاتی ئێران : (عەوالی – مسجدسلێمان – مریان – بەزرگان).
٢٦. بە پلەی یەکەم دێت لەبەکارهێنانی ئاودا بۆبەرهەمهێنانی کارەبا لەجیهاندا :
(کەنەدا –ژاپۆن – ولاتە یەکگرتوەکان –ئیتالیا).
٢٧. گرنگترین حەوزی خەڵوزە لەخۆرئاوای ئەڵمانیای یەکگرتوو بەمەڵبەندێکی گەورەی کۆبوونەوەی پیشەسازی ودانیشتوان دەژمێردرێت :
(دۆنتز– کۆزنتسک – رۆر– هۆبی).
٢٨. گرنگترین کانەکانی یۆرانیۆم لە کەنەدا دەکەوێتە نزیك ڕووباری : (میسیسپی – مەکەنزی – کۆلۆمبیا – کۆلۆرادۆ).
٢٩. ئەو ووزەیەی لە بواری پیشەسازیدا بەربەرەکانی خەڵووز و نەوت دەکات بۆ بەکارهێنان وەك سووتەمەنیەکی بە کەڵك :
(هێزی کارەبا –گازی سروشتی –ووزەی زەرە – ووزەی خۆر).
٣٠. کەرستەیەکی رووەکیە لە سروشتدا دروستبووە لەناوبەردە نیشتووەکاندا هەیە بەشێوەی دەمار :
(نەوت –گازی سروشتی – خەڵووز- یۆرانیۆم).
٣١. ئەو کیشوەرەی کە بە پلەی دووەم دێت لە بوونی هێزی ئاودا : (ئاسیا – ئەوروپا – ئەفریقیا – ئوستralیا).
٣٢. بە پلەی یەکەم دێت لەڕووی توانای دەرهێنان و بەرهەمهێنانی نەوت لە ژێرزەوی دا :
(ولاتانی عەرەب - ولاتە یەکگرتووەکان –ڕۆژهەلاتی ئەوروپا – باکوری ئەمریکای باشور).
٣٣. گەورەترین دەوڵەتە لەناردنە دەرەوەی خەڵووز لەجیهاندا :
(روسیای فیدرالْ – چین - ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا – ئۆکرانیا).
٣٤. لەهۆیەکانی کەمکردنەوەی مەترسی تەواوبوونی نەوت،دڵۆپاندنی نەوتە لە بەردی : (گرانیت – سجیل – بازلت – نیس).
٣٥. ولاتانی عەرەبی بە پێی خەملاندنی ساڵی ١٩٩٦ لە : (٤٦٪ - ٦٢٪ - ٥٦٪ - ٣٩٪) ی پاشەکەوتی نەوتی جیهانی هەیە.
٣٦. ژاپۆن یەکێکە لە ولاتە سەرەکیەکانی بەرهەمهێنی کارەبای کارۆئاوی بەهۆی بوونی :
(زۆریی سەرمایە –زۆریی باران وڕووباری تیژڕەو –خەڵووزونەوت –تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو).
٣٧. ناوچەیەکی گەورەی بەرهەمهێنانی خەڵووزە بۆماوەیەك سەرچاوەی ئەسرەوتی وپشێوی بوو لەنێوان فەرەنسا وئەڵمانیا :
(وستڤالیا – هەرێمی سار – حەوزی رۆر – ئەکسی لاشاپیل).
٣٨. ئینگلتەرا ساڵی ١٩٦٩ لە ووزەی ئەتۆم : (٢٨,٥ – ١٨,٥ – ٢٦,٥ – ١٦,٥) ملیۆن کیلۆوات/کاژێر کارەبای بەدەستهێنا.
٣٩. زۆربەی نەوتی عەرەب بەهۆی : (کەشتی – شەمەندەفەر – لوولە – ئۆتۆمبیل) دەنێردرێتە دەرەوە.
٤٠. کیمانۆ لەگرنگترین مەڵبەندەکانی بەرهەمهێنانی ووزەی کارۆئاوییە لە هەرێمی کۆڵۆمبیای بەریتانی لە :
(کەنەدا – کۆڵۆمبیا – بەریتانیا – ولاتە یەکگرتوەکان).
٤١. لەبەرئەوەی دەستی گرتبوو بەسەردەرهێنان و پالاوتنی نەوتەکەی،بۆیە زۆربەی نەوتەکەی دەنێردرابۆولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا:
(ڤەنزوێلا–بەرازیل—نیکوادۆر-کۆلۆمبیا).
٤٢. زۆرکەم بەشداری بازرگانی جیهانی دەبێت، تەنها لەسنورێکی تەسکی ولاتە دراوسێیەکان نەبێت:
(نەوت-بەرهەمی گۆشت-کارەبا-گەنم)
٤٣. کیشوەری ئەمریکای باکور خاوەن هێزێکی زۆری کارۆئاویە،چونکە بەناوبانگترین تاڤگەی تێدایە وەك:
(نیاگارا-ڤیکتۆریا-ئەنگل-میسۆری).

٤٤. عێراق لولەیەکی نەوتی بەرەو وڵاتی سعودیە ڕاکێشا ونەوتی پێدا دەڕوات بۆ بەندەری :
(تەرابلوس- جەیهان-بانیاس-**یەنبوع**).

٤٥. وزەیەکە ناتوانرێت عەمباربکرێت : (نەوت-گازی سروشتی-خەڵووز-**کارەبا**).

٤٦. لەوجۆرە کانزایانەیە کەبە پیتکردنەکەی سەرمایەکی زۆری تێدەچێت : (گۆگرد-**یۆرانیۆم**-قورقوشم-مەنگەنیز).

٤٧. بە گرنگترین ناوچەکانی بەرهەمهێنانی خەڵووز دادەنرێت لە بەریتانیا :
(**یۆرکشایەر**-دۆنباس-کلیفلاند- کۆزنتسک).

٤٨. گواستنەوەی نەوت بەهۆی : (**لولە**-کەشتی-ئۆتۆمبیل-شەمەندەفەر)سەرمایەکی زۆری دەوێت،بەڵام لەڕووی ئابووریەوە
پارەودەرامەتێکی زۆر بۆ وڵات گلْ دەداتەوە.

٤٩. کانە خەڵوزەکانی ئە پلاشیان لەوڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا گەلێک خاسیەتی چاکی ئابووری وسروشتی چاکیان تێدایە وەک نزیکی
دەمارە خەڵوزەکان لە : (کەناری دەریاکان-هێڵە ئاسنینەکان-**ڕووی زەوی**-ناوچەکانی کۆبونەوەی دانیشتوان).

٥٠. ڕێژەی کاربۆن تیایدا دەگاتە ٤٥٪ – ٦٥٪ :
(خەڵوزی کوک-خەڵوزی بتیۆمین-**خەڵوزی لەگنایت**-خەڵوزی ئەنثراسایت).

٥١. خەڵوز لەکانە خەڵوزەکانی یۆرکشایر لە ئینگلتەرا دەردەهێنرێت بە ڕێگەی :
(چاڵی قوڵ-**چاڵی کراوە**-تونێل- پوختەکردن لە پێکهاتووە نیشتووەکاندا).

٥٢. لەو دەوڵەتانەی خەڵووز دەنێرنە دەرەوەولەهەمان کاتدا هەندێك لەدەرەوە دەهێنن وەك:
(ئۆکرانیا–پۆڵەندا–ئینگلتەرا–**فەرەنسا**).

٥٣. بە گرنگترین ناوچەی بەرهەمهێنانی نەوت دادەنرێت لە روسیای فیدراڵ :
(باکوری چیای قەوقاز-حەوزی مۆسکۆ-**باکۆی دووەم**-باکوری دورگەی سەخالین).

٥٤. بە گرنگترین ناوچەی یەدەگی خەڵووز دادەنرێت لە روسیای فیدراڵ :
(**حەوزی کۆزنتسک**-ناوچەی تۆلا-حەوزی مۆسکۆ-ناوچەی چیای ئۆرال).

٥٥. ڕێژەی کاربۆن لە خەڵوزی بتیۆمین دەگاتە : (A- ٩٠٪ B- **٧٠- ٩٠٪** C- ٤٥ -٦٠٪ D- ٩٥٪).

٥٦. لەکێڵگە نەوتیەکانی مەراکیبۆ لە وڵاتی ڤەنزوێلا نەوت دەگوازرێتەوە بۆ پاڵێوگە نەوتیەکانی بەندەری :
(بیرا – **سان لۆرنزۆ** – ئارڤك – باطوم).

٥٧. گرنگترین کانەکانی بەرهەمهێنانی خەڵوز لە وڵاتی ئۆکرانیا لە حەوزی دۆنتز بریتیە لەکانی :
(کزباس – **دۆنباس** – کریڤۆری رۆج – کۆزنتسك).

٥٨. لەهەموو سەرچاوەکانی دیکەی ووزە زیاتر دەبێتە هۆی پیس بوونی ژینگە :
(**بە پیتکردنی یۆرانیۆم** – وزەی کارەبا – گازی سروشتی - تیشکی خۆر).

٥٩. دەرهێنان و گواستنەوەو پاڵاوتن و عەمبارکردنی ئاسانە : (ئاسن – گۆگرد – فۆسفات – **نەوت**).

٦٠. نزیکەی ٦٠٪ ی تێکڕای بەرهەمی نەوتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەرهەم دێت لە کانەکانی :
(چیای ئە پەلاش – **ویلایەتەکانی ناوەند** – مشیگان وئەلینوێ – کەنارەکانی کەنداوی مەکسیك).

٦١. بە یەکێك لەکانە نەوتیەکانی هەرێمی کوردستان دادەنرێت : (رومێلە – بەزرگان – **عەین زالە** – ئەهران عومەر).

٦٢. گرنگترین مەڵبەندی بەرهەمهێنی وزەی کارۆئاوی یە لە کەنەدا : (**کیمانۆ** – نیوفاوندلاند – لیبرادۆر – ئۆنتاریۆ).

٦٣. بە یەکێك لە شێوەکانی ووزە دادەنرێت زیاتر لەوەی سەرچاوەیەك بێت لە سەرچاوەکانی :
(خەڵووز – نەوت – گازی سروشتی – **هێزی کارەبا**).

٦٤. نەوتی ناوچەی ئەهواز لەئێران دەبرێت بۆ بازارەکانی جیهان دوای گواستنەوەی بۆ دورگەی :
(قیشم – هورمز – تونبی بچوك – **خەرج**).

٦٥. گرنگترین کانەکانی یۆرانیۆم لە وڵاتی کەنەدا دەکەوێتە نزیك :
(روباری کۆلۆرادۆ – کیمانۆ – روباری مەکەنزی – روباری کۆلۆمبیا).

٦٦. لە کانە نەوتیەکانی پارێزگای میسان : (اللحیس – بە تمە – فەککە – رومێلە).

٦٧. کۆنترین چەشنی خەڵووزە لە ڕووی پەیدابوونیەوە وچاکترین چەشنە و کەمتر بڵاوە :
(کوک – ئەنثراسایت – بتیۆمین – لەگنایت).

٦٨. بەم دواییە بەشداری پیشەسازی خۆراکی کرد بەوەی کەسەرچاوەیەکی پرۆتینە :
(گازی سروشتی – نەوت – ئەثیلین – فۆسفات).

٦٩. وڵاتێکە (١٠ ٪) ی ووزەی کارەبای کارۆئاوی جیهان بەرهەم دێنێ :
(ژاپۆن – وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا – کەنەدا – سویسرا).

٧٠. تاڤگەی ڤیکتۆریا لەکیشوەری ئەفریقیا دەکەوێتە سەر روباری : (نیل – کۆنگۆ – زەمبیزی – هیچ کامیان ڕاست نین).

٧١. بەشداری کردنی خەڵوز لە بازرگانی نێوان دەوڵەتاندا لەم ڕێژەیە تێپەڕناکات :
(A- (١ – ٢ ٪)  B- (١ – ٣ ٪)  C- (٥ – ٧ ٪)  D- (٢ – ٤ ٪).

٧٢. لەماوەیەکی دووردا بەرهەمهێنانی پارەیەکی کەمی تێ دەچێت :
(A- کارۆئاوی  B– ووزەی زەوە  C– گەرمەکارەبا  D– هەریەکە AوB ڕاستە).

٧٣. خەڵوزی بتیۆمین(ڤیری) کەبۆ دروستکردنی خەڵوزی کوک بەکاردێت لەهەندێك ناوچەی دیاریکراودا هەن وەك :
(حەوزی رۆر لە ئەڵمانیا – وێڵز لە خوارووی بەریتانیا –
چیاکانی ئەپلاش لە خۆرهەڵاتی وڵاتە یەکگرتووەکان – خۆرئاوای چین).

٧٤. بە دووەم ناوچە دادەنرێت لە ڕووی یەدەگی نەوت لە کیشوەری ئاسیا دوای ناوچەی کەنداوی عەرەبی :
(باکوری دورگەی سەخالین – کۆماری ئازربایجان – حەوزی کۆزنتسك – باکوروباشوری چیای قەوقاز).

٧٥. یەکێك لە کاریگەریەکانی نەوت لەسەر وڵاتە بەرهەمهێنەکان لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە :
(بووبە سەرچاوەی دەستکەوتی(داهاتی) نەتەوەیی – نیشتەجێبوونی کۆچبەران –
داگیرکردنیان لەلایەن وڵاتە پیشەسازیەکانەوە – هەموو وەڵامەکان ڕاستن).

٧٦. بە دابەشکردنی بڕی پاشەکەوت بەسەر بڕی بەرهەم دەپێورێت :
(بڕی بەکارهێنانی نەوت لە پیشەسازی – ڕادەی بەشداری کردنی نەوت لەبازرگانی دەرەکی
– ماوەی تەواوبوونی نەوت – ڕادەی بەکارهێنانی نەوت لەناوخۆی وڵات).

٧٧. کانەکانی ئەم ناوچەیە لە ٦٨ ٪ ی خەڵوزی ئەنثراسیتی هەموو جیهانی لێ بەرهەم دەهێنرێت :
(چیای ڕۆکی وکەنارەکانی زەریای هێمن – ئەپلاشیان –
ویلایەتی واشنتۆن – ویلایەتی داکوتای باکوروباشور).

٧٨. بڕی تیشکدانەوەی خۆر کە پێویستی جیهان پڕ بکاتەوە بۆ مەبەستی بەرهەمهێنانی ووزە لە تێکڕای ئەو ووزەیەی لەخۆرەوە دێت بریتیەلە : (A- ١ ٪  B- ٠,١ ٪  C- ٠,٠١ ٪  D- ٠,٠٠١ ٪).

٧٩. تەنها لە نێوان وڵاتە دراوسێکاندا بازرگانی پێوە دەکرێت :
(ووزەی کارەبا وفۆسفات – خوری ئاژەڵی زیندوو – ئاژەڵی زیندوو و فۆسفات – ئاژەڵی زیندوو و وزەی کارەبا).

٨٠. ناوچەیەکی بەرهەمهێنی نەوتە دەکەوێتە وڵاتی ڤەنزوێلا :
(خۆرئاوای روباری میسۆری – باکوری روباری میکۆنگ –
خۆرهەڵاتی دەلتای روباری ئۆرینۆکۆ – باشوری روباری ئەمەزۆن).

٨١. خەڵوز بە ڕێگای چاڵی کراوە دەردەهێنرێت لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە :
( خۆرئاوای پەنسلڤانیا – **هەرێمی ئەلینوی** – خۆرئاوای ڤەرجینیا – نیویۆرک ).

٨٢. کانە نەوتییەکانی سویدیە دەکەوێتە وڵاتی : ( سعودیە – کوێت – **سوریا** – بەحرەین ).

٨٣. گەورەترین و بایەخدارترین کانە نەوتیەکانی جیهان دەکەوێتە :
( خۆرئاوای ئەمریکای باکور – خۆرئاوای ئەوروپا – باشوری خۆرهەلاتی ئەمریکای باشور – **هیچ کامیان ڕاست نین** ).

٨٤. ژاپۆن و بەریتانیا خاوەندرێتی ووزەی زەرە( ئەتۆم ) ی جیهان دەکەن بە ڕێژەی : (٧٪ – ٨ ٪ – **٩ ٪** – ١٠ ٪ ).

٨٥. کەنەدا و ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بە هاوبەشی وزەی کارۆئاوی بەرهەم دێنن :
( لەسەر روباری مسیسپی – لە تاڤگەی ڤیکتۆریا لەسەر روباری زەمبیزی
– **لە تاڤگەی نیاگارا و روباری سانت لۆرنس** – لەسەر روباری کۆلۆرادۆ ).

٨٦. بۆ بەرهەمهێنانی ، دەوڵەت تووشی کۆسپی هونەری و ئابووری دەبێت : ( نەوت – **یۆرانیۆم** – ووزەی خۆر – خەڵووز ).

٨٧. کانەکانی چیای رۆکی وکالیفۆرنیا لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرهەمیان گەیشتۆتە :
( ١٥٪ – **١٠٪** – ٢٠٪ – ٣٠٪ ) ی سەرجەمی بەرهەمی ولات .

٨٨. بۆ بەکارهێنان پاك وتەمیزە و بە ئاسانیش دەردەهێنرێت : ( نەوت – خەڵووز – **گازی سروشتی** – هێزی کارەبا ).

٨٩. خۆرهەلاتی روسیای فیدرال بە ناوچەی یەدەگی خەڵووز دادەنرێت وەك کانەکانی :
( تولا – **کزباس** – دۆنباس – کریفۆری رۆج ).

٩٠. نەوتی بەهۆی لولە دەبرێت بۆ دورگەی خەرج و لەوێشەوە دەنێردرێت بۆ بازاڕەکانی جیهان :
( **ئێران** – سعودیە – کوێت – ئیمارات ).

٩١. خەڵووزی بەردین ریز دەکرێت ( دابەش دەکرێت ) لەسەربنچینەی :
( A- باری رامیاری B– پلەی کۆنی دروست بوونی
C– رێژەی پێکهاتنی لەکاربۆن **D– هەریەکە لە C و B ڕاستە** ).

٩٢. لەسەردەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان چەندین کانە نەوت خراونەتە کار وەك :
( A-شیواشۆك B– باباگوڕگوڕ C– تاوکێ **D– هەریەکە لە C و A ڕاستە** ).

٩٣. بە پێی خەملاندن دەوڵەتانی خۆرهەلاتی ناوەراست رێژەی : ( ١٤٪ – ١٣٪ – ١٠٪ – **٢٨٪** ) نەوت دەنێرنە دەرەوە لەجیهاندا .

٩٤. ئەو ناوچەیەی دەکەوێتە نێوان روباری روباری ڤۆلگا و چیای ئورال بۆ بەرهەمهێنانی نەوت لە روسیای فیدرال پێی دەوترێت :
( سیبیریا – **باکۆی دووەم** – کزباس – سانت پترسبۆرگ ).

٩٥. ئەم جۆرە خەڵوزە لە پیشەسازیدا بەکاردێت وەك سەرچاوەیەکی ووزە و کەرەستەیەکی خاوە بۆ دروستکردنی خەڵوزی کوك و بەرهەمهێنانی گاز( غاز ):
( A- **بتیۆمین** B– ئەنتراسایت C– لەگنایت D– هەریەکە لە C و B ڕاستە ).

٩٦. گواستنەوەی نەوت بەهۆی لولە( بۆری ) :
( **هەرزانترین هۆیە** – تەنها بۆناوخۆی ولات بەکاردێت – بەڕاددەیەکی کەمە – پێویستی بە سەرمایەی زۆرنییە ).

٩٧. هێزی کارەبا دادەنرێت بە یەکێك لە شێوەکانی ووزە زیاتر لەوەی کە سەرچاوەیەك بێت لە سەرچاوەکانی ، چونکە :
( دەتوانرێت عەمباربکرێت – کۆتایی دێت – **ڕاستەوخۆ لەسروشت وەرناگیرێت** – بەئاسانی دەستی بەسەردادەگیرێت ).

٩٨. لە گرنگترین کانە نەوتەکانی ولاتی ئێرانە : ( عەوالی – مریان – فهود – **لالی** ).

٩٩. بەسەرچاوەی بنچینەیی دادەنرا بۆئەو ئامێرانەی کەبەهێزی هەڵم کاریان دەکرد لەشۆرشی پیشەسازی دا :
( ئەتۆم – نەوت – گازی سروشتی – **خەڵوزی بەردین** ).

# بەشی پێنجەم / کانزاو کانزاکاری

**بۆشایی**/دروست بوون و پێکهاتنی کانزاکان لە سروشتدا پشت بە بار و شوێنەواری دیاریکراو دەبەستن وەك :

١- پێکهاتنی جیۆلۆجی زەمین .

٢- جۆری ئەو بەردانەی رووی زەویان دا پۆشیوە .

**بۆشایی**/ یەکەم کانزا کەسەرنجی ئادەمیزادی ڕاکێشاوە و لەژیانی کرداری خۆیدا سوودی لێ وەرنەگرتووە زێڕ بووە.

**بۆشایی** / خەڵوز و نەوت لەوناوچانەدا هەن کە پێکهاتووە لە لەبەردی نیشتوو ،ئاسن وس لەوناو ناوچانەدا هەن کە پێکهاتووە لە بەردی ئاگرین، زێڕ وزیو وقورقوشم لەوناوچانەداهەن کە پێکهاتووە لە بەردی گۆڕاو و نیشتوو.

**کانزا** : هەر ماددەیەك توێژاڵی زەوی پێك بێنێت و لە چوارچێوەی بازرگانیدا بەکاربهێنرێت کانزایە ، هەروەها هەر ماددەیەك کە لە ناوجەرگەی زەوی یان لەسەر رووی زەوی دەربهێنرێت بۆ مەبەستی کەڵك وەرگرتن لێیان و لەو بەردانەی کە لە ناو زەویدان ، یان دەوریان داوە بە کانزا دادەنرێن .

**بەرد** : بریتیە لە تێکەڵێکی سروشتی کە لە دوو کانزا یان زیاتر پێك هاتووە و ، دەکرێت بە سێ جۆر : ئاگرین و نیشتوو و گۆڕاو .

**کانزا نیشتووەکان** : بەشێکن لە توێژاڵی زەوی کە لە کانزایەك یان چەند کانزایەك پێك دێن کە بەهێندەی پێویست دەتوانرێت ئابووریانە وەبەر بهێنرێت لە بارودۆخێکی گونجاو بۆ وەبەرهێنان .

**دابەش بوون و کۆبوونەوەی کانزای خاو لە توێژاڵی زەوی لە هەندێك لای جیهاندا ، بە چەند هۆیەکەوە بەندن ، گرنگترینیان :**

١- تەمەنی بەرد و مێژووە جیۆلۆجیەکەی : هۆ/ مرۆڤ ناتوانێت لەو ناوچانەی نەوتیان تێدایە بۆ خەڵووز بگەڕێت ؟

چونکە خەڵووز لەو بەردانەدا هەیەکە لەچاخی خەڵووزیدا هەبوون، لەکاتێکدا نەوت لە ناوچەی بەردە نیشتووە نوێیەکاندا دەست دەکەوێت .

٢- بەرد بە جوولەی توێژاڵی زەوی و داماڵران کاری تێدەکرێت :

هۆ/ دابەش بوون و کۆبوونەوەی کانزای خاو بە جوولەی توێژاڵی زەوی و داماڵران کاری تێ دەکرێت ؟

چونکە لەئەنجامی جوولەی هەمەجۆری زەوی هەندێك لەبەشەکانی توێژاڵی زەوی بەرز دەبنەوە وهەندێکی تریش نزم دەبنەوە، جا لە کاتی بەرزبوونەوەدا بەردەکانی ناوجەرگەی زەوی لەناوەوە بەرز دەبنەوە، لەحاڵەتێکدا ئەگەر ئەوبەردانە تووشی داماڵران هاتن، ئەوا بەردەکانی ناوەوە لەسەر رووی زەوی دەردەکەون و، دەبن بە سەرچاوەی سەرەکی بۆ گەلێك کانزا هەروەك لە چیاکانی ئۆراڵدا .

٣- ئاووهەوا : ئاووهەوا دەورێکی باڵای لە دۆزینەوەی کانزادا هەیە ؟

چونکە ئەو شوێنانەی کە ئێستا خەڵووزیان زۆرە لە کۆندا ئاووهەوایەکی نیمچە گەرمیان هەبووە کە بۆتە هۆی گەشەکردنی ئەو جەنگەڵ و لێڕەوارانەی بوون بە ژێر نیشتووەکاندا و ، بە تێپەڕبوونی چەرخێکی زۆر بوون بە بەرد ، و خەڵووزی بەردینیان لێ دروست بووە . بەڵام ئەو ناوچانەی کە زۆر وشکن ، ئاووهەوا یارمەتی داوە بۆ پێکهاتنی عەماری گەورەی نیترراتی سۆدیۆم وەك لەناوچە بیابانەکانی شیلی و پیرۆ .

| ڕێگای کانزاکاری لەو کانانەی کە کراون | کانزاکاری بە ڕێگای بیری قوونەوە | ڕێگای کانزا پوختەکردن لە پێکهاتووە نیشتووەکاندا |
| --- | --- | --- |
| ١- لەو ناوچانەدا دەکرێت کە ئەگەر کانزا خاوەکە لە ڕووی زەویەوە نزیک بێت .<br>٢- لابردنی چینەکانی سەرەوەی توێژاڵی زەوی .<br>٣- بە ڕێگەیەکی ئابووری دادەنرێت ؟ چونکە خەرجی بەرهەم هێنان کەمترە و هیچی ناوێت تەنیا ئامێر و مەکینەی تایبەتی نەبێت بۆ لادانی چینەکانی سەرەوەی توێژاڵی زەوی .<br>٤- باری سروشتی سنووری بۆ دادەنێت و ناتوانرێت لە هەموو بارێکی ئاووهەوادا ئە نجام بدرێت .<br>٥- وەك کانزاکاریی ئاسن لە ناوچەی میساپی لە ولاتە یەکگرتووەکان کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای دەریاچەی سوپەریۆر و ناوچەی کیرۆنا جالفاری لە سوید و کریفۆری ڕۆج لە ئۆکرانیا . | ١- لەو ناوچانەدا دەکرێت کە ئەگەر کانزا خاوەکە لە ڕووی زەویەوە دووربێت .<br>٢- بیری قوول هەڵدەکەنرێت کە هەندێ جار دەگاتە (٢کم) .<br>٣- ئەم ڕێگەیە زۆری تێدەچێت ؟ چونکە پێویستی بە هۆی بەرهەم هێنان ( ئامێر و مەکینە )ی گەورە و زۆر دەبێت .<br>٤- دەتوانرێت لە هەموو بارێکی ئاووهەوادا دەربهێنرێت .<br>٥- وەك کانەکانی ( ڕند ) بۆ زێڕ لە باشووری ئەفریقیا و ، کانە زێڕەکانی ( میسۆر ) لە هیندستان . | ١- ئاوێکی بەخوڕی تێدەکرێ تا کاریگەری لەسەر وورد بوونی نیشتووەکانی و پاڵیان پێوەبنێت بۆ بەنداوێك تا بنیشێت .<br>٢- ئینجا کانزاکە لەسەر یەك دەنیشێ و لە پشت بەنداوەکە کۆدەکرێتەوە .<br>٣- بە ڕێگەیەکی کۆن و ئاسان دێتە دی ؟ چونکە نە سەرمایەیەکی زۆر و نە ئامێری تایبەتی و ئاڵۆزیشی دەوێ .<br>٤- دەتوانرێت لە هەموو بارێکی ئاووهەوادا دەربهێنرێت .<br>٥- ئەم ڕێگەیە لە زۆر ناوچەی جیهان بەکاردەهێنرێت و ، ١٠٪ی زێڕی جیهان بەم ڕێگەیە دەردەهێنرێت ، هەروەها پلاتین و تەنەکە و ئەڵماس و هی تریش . |

بۆشایی/ ڕێگەی کانزاکاریی پشت دەبەستێ بە : ① چەشنی کانزاکە. ② پێشکەوتنی هونەری کانزاکاری و پیشەسازی .

ئەو بنچینانەی لە کانزاکاریدا پشتیان پێ دەبەسترێت : دەتوانین لە کرداری کانزاکاریدا پە نجە بۆ دوو بنچینە ڕاکێشین :

١- ئەو نیشانە سروشتیانەی کە لە خاوی کانزاکانی ژێر زەویدا هەن کە ئەمەش ڕێگەی بەکارهێنان و دەرهێنانی ئەم کانزایانە دیاری دەکات .

٢- نرخی ئابووری کانزا خاوەکان ، ئەمەش شوێنی پێکهاتە کانزاییەکان و ڕێژەی کانزاکە لە خاوەکەیدا و بڕی ئەو کانزایەی کە هەیە دەگرێتەوە .

## ئەو هۆیانەی کاردەکەنە سەر وەبەر هێنانی کانزا :

① قەبارەی نیشتووەکان و ڕێژەی کانزا لە خاوەکەیدا :

هۆ/ ڕێژەی کانزا و پاکیەکەی لە خاوەکەدا ,ڕادەی برەوی وەبەرهێنانەکەی دیاری دەکات ؟

چونکە پلە هەیە بۆ باشی کانەکانی کانزاکان ، بۆ نموونە کان هەیە پلەی زۆر بەرزە وەکو ئەوکانە ئاسنانەی کە ڕێژەی کانزا لە خاوەکەیاندا لە ٥٠٪ زیاترە و ، مس لە نێوان (١-٥٪) و ، زێڕ لە (١-٠.٠٠٠٤٪) ، واتە ئەگەر ڕێژەکە لەمە کەمتر بوو ، ئەوا کانزاکە نرخی ئابووری نابێت .

② دووری مادده خاوەکە لە ڕووی زەویەوە :

چونکە دەرهێنانی کانزا لە کانە قوولەکاندا زۆرتری تێدەچێ لەچاو وەبەرهێنانی ئەو کانزایانەی کە لە سەرەوەی توێژاڵی زەویدان ، یان لە توێژاڵی زەویەوە نزیکن .

③ شوێنی جوگرافی : شوێنی جوگرافی ڕۆڵێکی دیار و بنەڕەت لە وەبەرهێنانی کانزا دا دەبینێت ؟

چونکە کانزا هەیە بە باشی شوێنەکەی جیادەکرێتەوە لە ڕووی هۆیەکانی گواستنەوە و کۆبوونەوەی دانیشتوان و نزیکی لە مەڵبەندەکانی چالاکیە پیشەسازیەکان ، هەروەك لە ( میصر ) کە سامانە کانزاییەکانی لە کەنارەکانی کەنداوی سوێس و دەریای سوور و دۆڵی نیل کۆبوونەتەوە .

هۆ/ وەبەرنەهێنانی کانزا خاوەکان لە زائیر ـ کۆنگۆی دیموکراتی ( هەرێمی شابا ) ؟

چونکە شوێنی جوگرافیەکەی کە لە کەنارەوە دوورن یارمەتی وەبەرنەهێنانی داوە .

هۆ/ کانزای زۆر دەوڵەمەند هەیە بەڵام شوێنە جوگرافیەکەی یارمەتی وەبەرهێنانی نەداوە ئەوەی لەم ڕێسایە دەردەچێت زێڕە ؟

چونکە بەرهەمهێنانەکەی تۆڵەی ئەو پارەیە دەکاتەوە کە تێی دەچێت.

④ بوونی هۆی گواستنەوە :

هۆ/ ڕێگای گواستنەوە بە هۆیەکی گرنگ دادەنرێت لە دیاری کردنی توانای وەبەر هێنانی کانزاکان لە ڕووی ئابووریەوە ؟

چونکە هەندێك کانزا هەن کە کێشیان قورسە و قەبارەشیان گەورەیە و کەم بایەخیشن بە گوێرەی کێش و قەبارەیان ، هەروەها زۆربەی کانزا فلزیەکان کاتێ کە دەچنە پیشەسازیەوە کێشیان زۆر کەم دەکات ، ئەمەش وادەکات کە بڕێکی زۆری خاوەکە بگوازرێتەوە بۆ وەدەست هێنانی فلزێکی کەم .

هۆ/ وەبەرهێنانی کانەکانی خەڵووزی مەنشوریا بۆماوەیەکی زۆر خرانە پشت گوێ ؟

هۆ/ تەنیا پێش چەند ساڵێك دەست کراوە بە بەرهەمهێنانی ئاسن لە بەرازیل ؟

و/ بەهۆی زۆری تێچوونی گواستنەوە بۆ شوێنی بەکاربردنی .

⑤ بوونی سەرمایە : سامانی کانزا لە هەموو بوارەکانی چالاکیە ئابووریەکان زیاتر پێویستی بە سەرمایەی زۆر و زەوەند هەیە ؟

چونکە پێویستی بە کرداری زۆر و خەرجی هەیە بۆ گەڕان و پشکنین بەدوای کانزاکان و دەرهێنانی کانزاکان لە کانەکان .

هۆ/ سەرمایە کارێکی زۆر گەورەی هەبوو لەوەی کۆمپانیا مۆنۆپۆڵە( قۆرخکاریە ) جیهانیەکان دەست بەسەر سامانی کانزایی دەوڵەتانی جیهانی سێیەمدا بگرن ؟

چونکە ئەو دەوڵەتانە تازە پێگەیشتوون و سەرمایەیەکی ئەوتۆیان نیە کە سامانە کانزاییەکانیان وەبەربهێنن .

⑥ هۆی تر ، وەك بوونی سەرچاوەی ووزە و سووتەمەنی پێویست ، و ئاووهەوا و بڕی یەدەگ :

هۆ/ بڕی یەدەگ کاردەکاتە سەر کرداری وەبەرهێنانی کانزاکە ؟

چونکە تا یەدەگی کانزاکە زیاتر بێت ئەوا زیاتر کرداری بەرهەم هێنان کۆدەکاتەوە .

**چەشنەکانی کانزا :** چەشنەکانی کانزا بە پێی ئەرکی کانزاکە و بەکارهێنانی دابەش دەکرێت بۆ :

١- سووتەمەنی کانزا وەك خەڵوز و ( ماددە هایدرۆکاربۆنیەکان ) وەك نەوت و گازی سروشتی وبەردەبارانی.

٢- **کانزا فلزیەکان :** هەموو ئەو کانزایانە دەگرێتەوە کە لە بەرهەم هێنانی فلزەکاندا بەکاردێت و لەکاتی پوختەکردنیشیاندا بەوە جیادەکرێنەوە کە نەرمن و بریسکەدارن و گەرمی و کارەبا باش دەگەیەنن . گرنگترینیان :

أ - خاوەکانی ئاسن .

ب- فلزە داڕشتەکان وەك کرۆم و مەنگەنیز و نیکل و تەنگستن .

ج- فلزە نا ئاسنینەکان وەك مس و قورقوشم و زینك و تۆتیا .

٣- کانزا نافلزەکان و خوێیەکان وەك گۆگرد وترشی گۆگردیك و نیتراتی فۆسفات و پۆتاسیۆم و مایکا.

٤- بەردە بەنرخەکان : بەردە دەگمەنەکانیش دەگرێتەوە وەك ئەڵماس و فەیروز و زوبەرجەد .

٥- بەرد : وەك گرانیت و بەردی جیری و ڵمی و بازڵت و نیس .

**بۆشایی /** کانزاکان زۆرن و ژمارەیان لەکاتی ئێستادا گەیشتۆتە نزیکەی ٧٥ کانزا ،هەندێك لەوکانزایانە بایەخێکی زۆریان لە ژیانی مرۆڤدا هەیە وەك ئاسن و مس .

**هۆ/ ئاسن لە کاتی ئێستاماندا لە هەموو کانزاکان گرنگترە ؟**

**بەهۆی ئەم خاسیەتانە :**

١- لە گەلێك پیشەسازی گۆڕینکاری و دەرهێناندا بە ماددەیەکی سەرەکی دادەنرێت .

٢- بەشێوەیەکی فراوان لەچینەکانی توێکڵی زەویدا بڵاوبۆتەوە(٥٪ ی ئەو ماددانەی کە ئەم توێکڵی زەمینە یان لێ پێك دێ).

٣- دەتوانرێت بە ئاسانی لە خاوەکانی تر پوختە بکرێت و جیابکرێتەوە .

٤- تێکەڵ کردنی ئاسانە لەگەڵ کانزاکانی تری وەك کرۆم مەنگەنیز و نیکل ، ئەمەش وای لێدەکات کە بچێتە پیشەسازی دروست کردنی دینەمۆ و مەکینەکانی سووتانی ناوخۆیدا .

٥- نرخەکەشی نزمە و بە ئاسانیش دەتوانرێت دەست بەسەر رادەە و پلەی رەقێتیەکەیدا بگیرێت .

**چەشنەکانی ئاسن :** ئاسنی پوخت لە سروشتدا نیە،بەڵکو بە شێوەی ئۆکسید و کاربۆنات و خاوی هەمە چەشن هەیە ، گرنگترینیان :

١- **ماگناتایت ( ئاسنی مەگناتیس )** :خاوێکی رەشە و رێژەی ئاسنە پوختەکەی ٧٢.٥٪ دەبێت . باشترین جۆری ئاسنە ، لە سروشتدا کەمە ، لە ناوچەی بەردی ئاگرین و بەردی گۆڕاودا هەیە ، بەتایبەتی لە باکووری سوید .

٢- **هیماتایت (ئۆکسیدی ئاسن )**:رەنگەکەی سوورە و رێژەی ئاسنە پوختەکەی ٧٠٪ دەبێت ، لە ناوچەی بەردی نیشتوودا هەیە وەك لە روسیا و وڵاتە یەکگرتووەکان و ئیسپانیا .

٣- **لیمۆنایت( لیمۆتایت )** : رەنگەکەی لە نێوان زەرد و قاوەییدایە و رێژەی ئاسنە پوختەکەی ٦٠٪ دەبێت ، لە ناوچەی بەردی نیشتوودا هەیە وەك لە ناوچەکانی لۆرین لە فەرەنسا .

٤- **سیدرایت ( کاربۆناتی ئاسن )** : کەم بایەخە و رێژەی ئاسنە پوختەکەی ٤٨٪ دەبێت وخڵتەی زۆرە ،لە خۆرهەلاتی ئینگلتەرا هەیە.

٥- **پایرایت :** چەشنێکی خراپ و بەدە،چونکە رێژەی ئاسنە پوختەکەی ٤٢٪ دەبێت ، وخڵتەی وەك گۆگرد و مسی زیاتر تێدایە . بۆ دەرهێنانی ترشی گۆگردیك بەکاردێت ،خاوەکانی لە ناوچە تازە پەیدا بووەکانی جیهان بڵاوە.

**چۆنێتی پوختەکردنی ئاسن لە خاوەکانیدا :**

١- **ئاسنی زەهر ( گل ئاسن )** : ئەو چەشنە ئاسنەیە کە لە یەکەم قۆناغی پوختەکردنی ئاسندا دەست دەکەوێ ، کاتێ کە خاوەکانی ئاسن تێکەڵ دەکرێت لەگەڵ خەڵوزی کوك و قیر ،ودەخرێتە ناو فرنێکی زۆر گەرم کە پێی دەڵێن ( کانزا توێنەرەوە ) کە ئاسنەکە لە خاوەکەی جیادەکاتەوە و لە بنی فرنەکەدا دەنیشێت و پاشان ئاسنەکە لەکونەکانی ژێر بنکەی فرنەکەدا وەردەگیرێت کە چەشنێکی پوخت نیە و خڵتەی زۆرە ،چونکە کاربۆن و کبریت و فۆسفۆری تێدایە ، و زۆر رەق نیە بەکاردێت بۆ دروست کردنی ستوونی کارەبا و بۆری ئاو .

٢- ئاسنی گونجاو :ئەو چەشنە ئاسنەیە کەلە دووەم قۆناغی پوختەکردنی ئاسندا دەست دەکەوێ ئەویش پاش پاك کردنەوەی ئاسنی زەهر (گل ئاسن) لەخڵتەکانی کاربۆن وکبریت وفۆسفۆر.ئیتر ئاسنەکە جێری پەیدادەکات و رەقتر دەبێت.بەکاردێت بۆئاسنگەری (حدادة).

٣- پۆڵا : ئەو چەشنە ئاسنەیە کە لە سێیەم قۆناغی پوختەکردنی ئاسندا دەست دەکەوێ ئەویش ئەگەر بێتوو (ئاسنی گونجاو) ڕێژەیەك مەنگەنیزی لەگەڵ تێکەڵ بکرێت . پۆڵا لە هەموو جۆرەکانی تری ئاسن زیاتر بەکاردێت چونکە زۆر رەقە .

هۆ/ بەرهەم هێنانی ئاسن لە جیهاندا بەرزی و نزمییەکی زۆری بەخۆیەوە دیوە ؟

و/ لەبەر ئەوەی پەیوەندی بە ڕامیاری دەوڵەتان و بە باری ئابووریەوە هەیە ، کە لە کاتی جەنگدا بەرهەم هێنانەکە زۆرتر دەبێت و لە کاتی ئاشتیشدا تا ڕادەیەك کەمتر دەبێتەوە .

هۆ/ دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان هێشتا نەچوونەتە قۆناغی بەرهەم هێنانی ئاسن ، مەگەر لەم چەند ساڵەی دواییدا نەبێت ؟

و/ ① بەهۆی کەم بوونەوەی کانەکانی وولاتە پیشەسازیە گەورەکان .② زۆر بوونی خواست و پێویستی جیهانی بۆ ئاسن .

بۆشایی/ ناوچە سەرەکیەکانی بەرهەمهێنانی ئاسن لەجیهاندا لەهەمان کاتدا ناوچەی سەرەکین بۆ بەرهەمهێنانی خەڵوزی بەردین.

## دابەش بوونی جوگرافی ئاسن لە ڕوسیای فیدراڵ :

١- ناوچەی چیای ئۆراڵ : خەریکە چەشنە باشەکەی نامێنێت ؟ چونکە لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە زۆر وەبەر دێت .

ماگنیتۆ کۆرسك : بە گرنگترین ناوچەی پیشەسازی ڕوسیا دادەنرێت ، لەبەر ئەوەی لە کانە ئاسنەکانی چیای ئۆراڵ نزیکە .

٢- کانەکانی باشووری خۆرئاوای مۆسکۆ .

٣- ناوچەکانی خۆرهەڵاتی تورکستان نزیك حەوزی خەڵوزی کۆزنتسك، کە هەرچەندە خاوەکانی زۆرچاك نین.بەڵام گرنگن ، چونکە کەوتوونەتە نزیك کارگەکانی ناوچەی سیبیریا .

## دابەش بوونی جوگرافی ئاسن لە ئۆکرانیا :

(١) کریفۆری رۆج: بەگرنگترین کانەکانی بەرهەم هێنانی ئاسن دادەنرێت لە ئۆکرانیا کەدەکەوێتە نزیك کانەخەڵوزی حەوزی دۆنتز.یەدەگێکی زۆریشی تێدایە کە بە ١ ملیار تۆن زیاتر مەزندە دەکرێ.کارگەکانی خۆرهەڵاتی ئەورووپا پشت بەو بەرهەمە دەبەستێت .

(٢) کانە ئاسنەکانی نیمچە دورگەی قرم.

هۆ/ سەرکەوتنی بەرهەم هێنانی ئاسن لە ئوسترالیا ؟ هۆ/ ئوسترالیا توانی بە پلەی دووەم بێت لەبەرهەمهێنانی ئاسن لەجیهاندا؟

و/ بەهۆی دۆزینەوەی فراوان وخێرای خاوەکانی ئاسن لە ناوچە بەربڵاو و جیاوازەکانی ئوسترالیا.

هۆ/ بەرهەم هێنانی ئاسن لە وولاتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٦٩لە (٥٢) ملیۆن تەن کەمی کرد بۆ (٤٧) ملیۆن تەن لە ساڵی ١٩٩٢ ؟

و/ چونکە خاوەکانی ئاسن لە گەڵێك ناوچەی جیهان بە پارەیەکی کەمتر وەبەر دەهێنرا لەچاو فلزەکانی ئەمەریکا کە ئەمەش وای کرد ئاسن و پۆڵا لە دەرەوە بهێنێ و لە پیشەسازیەکانی خۆیدا پشتی پێ ببەستێ .

## دابەش بوونی جوگرافی ئاسن لە وولاتە یەکگرتووەکان ئەمەریکا :

١- کانەکانی ناوچەی دەریاچە گەورەکان : کە بە زۆریی دەکەونە نزیك دەریاچەی سوپەریۆر .

٢- کانەکانی ویلایەتی ئەلەباما :کە لە (٥ – ١٠ ٪) ی بەرهەمی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای لێ دەردەهێنرێت.کانەکانی لە نزیك شاری ( پەرمەنگەهام )ی پیشەسازیە ،کەلەبەر نزیکی لە کانە خەڵووزەکانەوە بایەخێکی زۆری پەیداکردووە .

٣- کانەکانی ویلایەتەکانی ( نیویۆرك و نیوجرسی و پەنسلڤانیا و کالیفۆرنیا ) .

## دابەش بوونی جوگرافی ئاسن لە کەنەدا :

١- باکوور و خۆرهەڵاتی ناوچەی دەریاچە گەورەکان : کە لە کاتی جەنگی جیهانی دووەم ئاسنی لێ دۆزرایەوە .

٢- دورگەی نیوفاوندلاند لە باکووری خۆرهەڵاتی کەنەدا لەسەر کەناری زەریای ئەتڵەسی ، کە کانەکانی تا ژێر زەریاکە بە ئەستوویەکی زۆر درێژ بوونەتەوە .

٣- ناوچەی لیبرادۆر لە خۆرئاوای دوورگەی نیوفاوندلاند .

**دابەش بوونی جوگرافی ئاسن لە چین :**

**١- ناوچەی مەنشوریا . ٢- دۆڵی ڕووباری یانگستی . ٣- باکووری خۆرئاوای پەکین .**

**کیرۆنا جالفاری :** گرنگترین کانەکانی ئاسنە لە وڵاتی سوید کە دەکەوێتە باکووری وڵات ، زۆربەی بەرهەمەکەی کە لە جۆری ماگناتایتە دەگاتە نزیکەی ٥ ٪ی بەرهەمی جیهانی ، لە ڕێگەی بەندەری ( نارڤک )ی نەرویجیەوە لەسەر زەریای ئەتڵەسی ، ڕەوانەی دەوڵەتەکانی ئەوروپا دەکات .

**نارڤک :** بەندەرێکی نەرویجیە لەسەر زەریای ئەتڵەسی ، کە لە ڕێگای ئەم بەندەرەوە ، زۆربەی بەرهەمی ئاسنی ناوچەی کیرۆنا جالفاری وڵاتی سوید ، ڕەوانەی دەوڵەتەکانی ئەوروپا دەکرێت .

**هۆ/ کرداری کانزاکاری ئاسن لە وڵاتی سوید تووشی کۆسپ دێت ؟**

چونکە لە ناوچەی کیرۆنا جالفاری پلەی گەرما نزمە بەهۆی ئەوەی دەکەوێتە ناو بازنە پانەکانی باکوور .

**بۆشایی/** زۆربەی بەرهەمی ئاسن لە فەرەنسا لە کانەکانی لۆرین و نۆرماندی دایە .

وەتەنها بەرهەمی کانەکانی لۆرین نزیکەی نیوەی بەرهەمی کیشوەری ئەوروپا دەبێت لە خاوی ئاسن .

**هۆ/ بەرهەمی ئاسن لە بەریتانیا ڕوو لە کەمیە ؟**

و/ چونکە لە کانزاکاریدا پێش وڵاتانی تری جیهان کەوتووە ( پێش ئەوان دەستی پێ کردووە ) .

**کلیفلاند :** گرنگترین ناوچەی ئاسنە لە بەریتانیا کە دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی وڵات و ، بەوە جیادەکرێتەوە کە خاوەکانی لە ڕووی زەویەوە نزیکن ، هەروەها کەوتونەتە نزیک نیشتووەکانی خەڵووز لە ناوچەی دەرم .

**هۆ/ بە گران دەتوانین بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و بە تەواوی مەزەندەی یەدەگی جیهانی خاوەکانی ئاسن بکەین ؟**

چونکە هێشتا گەڕان و پشکنین و هەڵکەندن دەربارەی ئەم کانزایە لە ڕووبەرێکی فراوانی گۆی زەویدا نەکراوە .

**بۆشایی/** شارەزایان بەزۆری یەدەگی جیهانی لە ئاسن دەکەن بەدوو کۆمەڵەوە:

**یەدەگی دڵنیایی :** ئەو چەندێتیە کانزایەیە کە لە بوونی دڵنیاین و دەتوانرێت لە کاتی ئێستادا وەبەربهێنرێت وبەکاربهێنرێت .

**یەدەگی چاوەڕوان کراو :** ئەو چەندێتیە کانزایەیە کە هێشتا مەرجی سروشتی وئابووری لەم کاتەدا بۆی ئەرەخساوە ، لەوانەشە لە دوارۆژدا لە ئەنجامی پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیا وەبەربهێنرێت .

**بۆشایی/** ئەوروپای خۆرهەڵات بە تایبەتی ڕوسیا و ئۆکرانیا دەوڵەمەندترین ناوچەی جیهانن لە بوونی یەدەگی دڵنیایی ئاسن .

**گرنگترین هۆیەکانی سەرەکی چالاکی بازرگانی ئاسن کە دەگاتە ٣٠٪ :**

**هۆ/ ئاسن دەورێکی باڵا لە بازرگانی نێوان وڵاتاندا دەبینێ ؟**

و/ ١- بوونی کانەکان و بەرهەم هێنانی خاوەکان لەو ناوچانەن کە هێشتا نەچوونەتە قۆناغی پێشکەوتنی پیشەسازی ، وەک هەندێ لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو کە ناچارن بەرهەمەکەیان بۆ دەرەوە بنێرن .

٢- بەشێکی زۆری کانەکانی ئاسن دەکەونە ئەو ناوچانەی کەوا مەرجی دامەزراندنی پیشەسازی لێ نیە وەک ناوچە جەنگەڵەکان و بازنەی جەمسەری ، بۆیە وا پێویست دەکات کە بیگوێزنەوە بۆ ناوچەکانی دروست کردن و پیشەسازی .

٣- بازرگانی ئاسن لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر لە چوارچێوەی یەك قاڕەشدا ئەنجام دەدرێ ، بۆ نموونە ئەڵمانیا ئاسن لە وڵاتانی تری قاڕەی ئەوروپا دێنێت ، ژاپۆنیش لە هیندستان ئاسن دەهێنێت .

**دەتوانین وڵاتانی جیهان لە بازرگانی خاوەکانی ئاسن بە پێی ئەم کۆمەڵانە جیابکەینەوە( پۆلێن بکەین ) :**

١- ئەو وڵاتانەی ئاسن لە دەرەوە دەهێنن وەك وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا و ئەڵمانیا و ژاپۆن ، بۆ پڕکردنەوەی پێویستی پیشەسازیە پێشکەوتووەکانیان .

٢- ئەو دەوڵەتانەی ئاسن دەنێرنە دەرەوە ، وەك وڵاتانی عەرەب و فەرەنسا و کەنەدا و سوید و ڤەنزوێلا ؟ چونکە ئەم وڵاتانە ئاسنیان لە پێویستی خۆیان زیاتر هەیە .

هۆ/ دۆزینەوەی مس بە سەرەتای چەرخێکی تازە دانراوە لە ژیانی مرۆڤدا؟

و/ چونکە مس جێگای بەردی گرتەوە لەو ئامرازانەی کە مرۆڤ لە ژیانی رۆژانەیدا بەکاری هێناون .

هۆ/ مس لەم کاتەی ئێستاماندا دەورێکی باڵا لە پیشەسازیدا دەبینێت ؟

و/ بەهۆی ئەم خاسیەتانە :

١- مس تێکەڵاوکردنی لەگەڵ کانزاکانی تردا ئاسانە، رێژەی ٤٠٪ ی بەرهەمی جیهانی ئەو کانزایە دەچێتە پیشەسازی تێکەڵە جیاوازەکان ، بۆنموونە برۆنز لە تێکەڵ کردنی مس و تەنەکە ، و مسی زەرد لە تێکەڵ کردنی مس و تۆتیا بەرهەم دەهێنرێت .

٢- مس گەیەنەرێکی باشە بۆ گەرمی و کارەبا،و زۆرلەبارە بۆ لێدان وکشان و،بەرگەی داخوران( خۆرك ) وهۆیەکانی ئاووهەواش دەکات .

٣- مس دەتوانرێ دووبارە بتوێنرێتەوە ئەمەش یاریدەی پاراستنی خاوەکانی دەدات .

هۆ/ پێویستە دەرهێنانی خاوەکانی مس لە کانەکانیەوە نزیك بێت پێش گواستنەوەی ؟

و/ چونکە ئەگەر رێژەی مس لە خاوەکانی ١.٥ - ٢٪ بێت ئەوا لەم حاڵەتەدا لە رووی ئابووری باش دەبێت و نرخی دەبێت و جا بۆ رزگار بوون لە خەرجی زۆری گواستنەوە پێویستە لە کانەکانیەوە نزیك بێت .

بۆشایی/خاوەکانی مس لە سروشتدا لە دوو شێوەدان :

١- کانزای فلزی کە لە چەند دەمارێك یان چەند پۆرگێك پێکهاتووە .

٢- خاوی کانزایی پەرش و بڵاو لە ناوچە بەرەدەڵانێکی فراوان .

چۆنێتی پوختەکردنی مس : خاوەکانی مس بەچەند قۆناغێکدا دەرۆن پێش ئەوەی بۆ پیشەسازی دەست بدەن:

١- پوختەکردنی فلزی مس لە خڵتە : ئەمەش بە هاڕینی فلزەکان دێتەدی ، پاشان ئاوێکی بەخوڕی دەکرێتە سەر بۆ راماڵینی ئەو خڵتانەی کە کێشیان کەمە و سووکترن ، کانزاکەش دەنیشێ .

٢- قۆناغی تواندنەوە : فلزەکانی مس دەتوێنرێنەوە ، و خڵتە و شتە زیادەکانیان لێ جیادەکرێتەوە بەتایبەتی ئەوەی کە بە کانزاکەوە گیرسابۆوە ، ئەم کردارەش لە نزیك کانەکان جێبەجێ دەکرێت .

٣- قۆناغی پاڵاوتن ( التصفیة ) : پاش قۆناغی تواندنەوە ، کانزای پاڵاوتە و پوخت دەستگیر دەبێت بەهۆی پاڵاوتنی بەهۆی کارەباوە ، ئەم کردارەش لەو ناوچانەدا دەکرێت کە سەرچاوەی ووزەی سەرەکیان تێدایە بە تایبەتی کارەبا .

هۆ/ لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا ، بەرهەمی مس رووی لە زیادی کرد ؟

و/ ① بەهۆی کارتێکردنی هەردوو جەنگی جیهانی کە بووە هۆی زۆر بەکارهێنانی لە پیشەسازی جەنگیدا .

② بەهۆی بڵاوبوونەوەی پیشەسازی کارەبایی کە زۆری لێ بەکاردەهێنرێت و وای کردووە کە برەوی زۆر بێت .

دابەش بوونی جوگرافی مس لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا :

١- ویلایەتی میشیگان : بەناوبانگترین ناوچەی بەرهەم هێنانی مسە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، بەڵام تەواوبوونی مس لەوێدا بووبەهۆی گەڕان بەدوایدا لە ویلایەتەکانی خۆرئاوا .

٢- ویلایەتەکانی خۆرئاوا : مس لەم ویلایەتانەدا بە تێکەڵاوی لەگەڵ کانزاکانی وەك قورقوشم و مەنگەنیز و زیڕدا هەیە .

هۆ/ باشیی وەبەرهێنانی کانزا ( مس ) لە ویلایەتەکانی خۆرئاوای وڵاتە یەکگرتووەکان ؟

و/ ① بەهۆی پێشکەوتنی رێگەی کانزاکاری و تواندنەوە . ② دامەزراندنی هێڵی ئاسن .

دابەش بوونی جوگرافی مس لە ژاپۆن: ١- دورگەی هۆکایدۆ ٢-دورگەی هۆنشۆ

دابەش بوونی جوگرافی مس لە شیلی : تا ساڵی ١٨٨١ یەکەم وڵاتی جیهان بوو لەبەرهەمهێنانی مس،بەڵام ئێستا پلەی سێیەمی هەیە:

١- باکوری شیلی لەبناری خۆرئاوای چیاکانی ئەندیز :بەدەوڵەمەندترین کانی جیهان دەژمێردرێت ورێژەی کانزالەخاوەکانیدا دەگاتە ٢٪.

٢- کانەکانی باشووری سانتیاگۆ لە چیاکانی ئەندیز : کە بۆ کرداری پاڵاوتن سوود لەو کارەبایە وەرگیراوە کە لە تاڤگە ئاوەکانی ناوچەکەدا بەدەست دێت .

٣- کانەکانی باشووری بیاباتی ئەتەکاما .

**دابەش بوونی جوگرافی مس لە کەنەدا** : خاوەکانی مس لە کانەکانی کەنەدا بەرێژەیەکی بەرز کانزاکەیان تێدایە کە دەگاتە ٥٪ .

زۆربەی بەرهەمەکەشی لە کانەکانی: ١- ویلایەتی ئۆنتاریۆ . ٢- ویلایەتی کیوبێک .

**ناوچەی مەنرۆلا** : گرنگترین کانەکانی مسە لە زامبیا کە دەکەوێتە باکووری ولات و درێژ دەبێتەوە بۆ هەرێمی شابا لە کۆنگۆی دیموکراتی ، ئەم کانانەش ، ① رێژەی کانزا لە خاوەکانیاندا دەگاتە ٤.٥٪. ② سەرەڕای نزیکیەکەی لە ڕووی زەویەوە ، زۆربەی بەرهەمەکەشی لە ڕێگەی بەندەری ( بیرا )ی مۆزەمبیق لەسەر زەریای هیندی ڕەوانەی دەرەوە دەکات .

**هۆ/ ئەو ژمارانەی کە دەربارەی یەدەگی مسی جیهانی دەدوێن بە ژمارەی کۆتایی دانانرێن ؟**

و/ چونکە گەلێک ناوچە لە جیهاندا هەن کە تا ئێستا بەسەر نەکراونەتەوە و نە پشکنراون .

**هۆ/گیروگرفتی مس یەکێکە لەوگیروگرفتە سەرەکیانەی کە پێویستە بیری لێ بکرێتەوە بۆدۆزینەوەی برە مسی ترکە بەشی جیهان بکات ؟**

و/ ① یەدەگی جیهانی بە ٣٦٠ ملیۆن تۆن دانراوە و تا ئێستا زیاتر لە ٢٣٧ ملیۆن تۆنی لێ بەکاربراوە .

② بوارەکانی بەکارهێنانی فراوان بووە و ڕوو لە زیاد بوونە .

**هۆ/ مس بە یەکێک لە کانزا دەگمەنەکان دانانرێت لە جیهاندا لەکاتی ئێستادا ؟**

و/ ① بەهۆی ئەگەری دووبارە بەکارهێنانەوەی مسی بەکارهاتوو بە بڕێکی ( هێندێکی ) زۆر .

② تا ئێستا کرداری گەڕان و پشکنین لە گەلێک ناوچەی جیهاندا تەواو نەبووە و ئەنجام نەدراوە .

**دەتوانین ئەمانەی خوارەوە لە بازرگانی مسی نێوان دەوڵەتاندا تێبینی بکەین :**

١- هەندێ دەوڵەت زۆربەی بەرهەمەکەیان دەنێرنە دەرەوە ، وەك: شیلی و زامبیا و کۆنگۆی دیموکراتی و کەنەدا .

٢- ئەو وڵاتانەی مس لە دەرەوە دێنن ، وەك: وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا و فەرەنسا و ژاپۆن وئەڵمانیا.

**بۆشایی/ ئەلەمنیۆم** بەناوبانگترینی ئەو کانزایانەیە کەلە سروشتدا بڵاوبونەتەوە وبەرهەمهێنانی تا ساڵی ١٨٨٦ ئابووریانە نەبوو.

**هۆ/ زۆر بەکاربردنی فافۆن لە بواری پیشەسازیدا ؟**

و/ زۆر بەکاربردنی فافۆن دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خاسیەت ( نیشانە ) وسیفاتانەی کە پێی جیادەکرێتەوە :

١- کێشی سووکە .

٢- بەرگەی داخوران ( خۆرك ) و ژەنگ لێدانی هەیە .

٣- بە ئاسانی دەکوترێتەوە و ڕادەکێشرێت .

٤- دەتوانرێت تێکەڵ بکرێت بە کانزای تری وەك مس و مەنگەنیز.

٥- گەیەنەرێکی باشە بۆ گەرمی و کارەبا .

٦- بۆ ڕووناکی و گەرمی دانەوە بە تینە .

**پوختەکردنی فافۆن :**

**بۆشایی/** فافۆنی پاك وبێگەرد لەسروشتدا نیە.بەڵکو لەناو فلزە زۆرەکاندا وەکو **کریۆلایت** و **کورۆم** و **بۆکسایت** دا هەیە .

**بۆکسایت** : گرنگترین خاوەکانە کە فافۆنی لێ دەردەهێنرێت و لە یەکگرتنی **ئۆکسیدی فافۆن** و **ئاو** پێکدێت و بە زۆریش لە ناوچە نزیکەکانی سەر ڕووی زەویدا هەیە و بەناوی شاری ( بۆکس ) لە فەرەنسا ناونراوە .

**قۆناغەکانی پوختەکردنی فافۆن :**

١- قۆناغی یەکەم : کرداری دەرهێنانی بۆکسایت لە زەوی .

٢- قۆناغی دووەم :جیاکردنەوەی ئۆکسجین لە ئۆکسیدی فافۆن : ئەمەش بەوە جێبەجێ دەبێ کە خاوی فافۆن بدرێتە بەر گەرماییەکی بەرز و پاڵەپەستۆیەکی بەتین بۆنەوەی کانزایەکی پاکی لێ بەرهەم بێت، ئەم کردارەش پێویستی بە تەوژمێکی کارەبایی یاخود بڕێکی زۆری خەڵوز هەیە.بۆیە لەوناوچانەدا بەجێ دەهێنرێ کە **سەرچاوەی وزەی** تێدا زۆرە.

**هەلومەرجی لەباری وەبەرهێنانی بۆکسایت و ڕەنێوهانینی ئەلەمنیۆم ( فافۆن ) :**

**هۆ/ مەرج نیە ئەو دەوڵەتەی کە بەرهەم هێنی بۆکسایتە ، دەوڵەتێکی ناوداری پیشەسازی فافۆن ( ئەلەمنیۆم ) بێت ؟**

چونکە بەرهەم هێنانی فافۆن پێویستی بە زۆر هەلومەرجی تایبەتی هەیە ، کە گرنگترینیان :

١- ڕێگەی گواستنەوەی هەرزان و ئاسان ؟ چونکە خاوی بۆکسایت لەو چەشنە خاوانەیە کە بە قەبارە گەورەن ئەگەر بەراوورد بکرێت لەگەڵ ڕێژەی ئەو کانزایانەی کە لێی دەردەهێنرێت .ڕێگەی گواستنەوەی دەریایی بە گونجاوترین ولەبارترین ڕێگە دادەنرێت.

٢- بوونی ووزەی کارەبایی هەرزان ؟ چونکە یەک تۆن فافۆن پێویستی بە هێزی کارەبایی ٢٥ هەزار کیلۆ وات هەیە .

٣- خاوەکانی بۆکسایت و باشیی جۆرەکەی دەبێ پشت بە باری ئاووهەوا ببەستێت ؟

چونکە لە ئاووهەوای مەیلەو گەرم و شێدار ( خولگەیی و نیمچە خولگەیی )دا جۆرەکەی باشتر دەبێت .

**دابەش بوونی جوگرافی بۆکسایت لە جیهاندا :**

١- ئوسترالیا : ساڵی ١٩٦٧ وەک دەوڵەتێکی بەرهەم هێنی بۆکسایت دەرکەوت لە ئەنجامی وەبەرهێنانی ئەو کانانەی کە تازە بۆکسایتی لێ دۆزرابۆوە ،وئێستا پلەی یەکەمی وەرگرتوە وساڵی ١٩٩٤ بەرهەمەکەی گەیشتە ٣٦,٥ ٪ ی بەرهەمی جیهانی.

٢- غینیا : کە لە باکووری خۆرهەڵاتی ( کۆناکرێ ) و دوورگەکانی بەرامبەر کەنارەکانیدا هەیە بەتایبەتی دوورگەی ( کاسا ) .

٣- جامایکا : بەناوبانگترین ناوچەکانی بەرهەمهێنانی بریتین لە ( سانت ئەندو و سانت ئەلیزابێت ) کە ئەم ناوچانەش دەکەونە نزیک کەنارەکانیەوە،ئەمەش یارمەتی ئەوەی دەدات کەوا بە ئاسانی ڕەوانەی دەرەوەی بکات بە تایبەتی بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان.

٤- سیرالیۆن .

**بازرگانی بۆکسایت و فافۆنی نێوان دەوڵەتان : لە بازرگانی بۆکسایتدا ئەمانەی خوارەوە تێبینی دەکرێت :**

١- بوونی وڵاتانی تازە پێگەیشتوو کە توانای دروست کردنی پیشەسازی فافۆنیان نیە ، بۆیە خاوەکانی بۆکسایت بۆ دەرەوە دەنێرن ، وەک :جامایکا ، سورینام ، دومنیکان ،یۆنان ...

٢- دەوڵەتە بۆکسایت هێنەکان : وەک وڵاتە یەکگرتووەکان ، بەریتانیا ، ئەڵمانیا ،ژاپۆن ، کەنەدا

٣- ئەو دەوڵەتانەی کە بۆکسایت لە دەرەوە دەهێنن و پاشان بە شێوەیەکی کەلوپەلی دروستکراوەوە دەنێرنە دەرەوە ، وەک: کەنەدا ، فەرەنسا ، ژاپۆن ، ئەڵمانیا .

٤- دەوڵەتە فافۆن هێنەکان ، وەک وڵاتە یەکگرتووەکان ، بەریتانیا .

**بۆشایی** / دەرکەوتووە ئەو ئەیزەکانەی لە لە بۆشایی دەرەوە هاتوون گۆگرد یان تێدایە.وە گۆگرد لەسروشتدا زۆرە بەڵام ناوچەکانی بەکارهێنانی هێشتا کەمن.

**هۆ/ گۆگرد لە پیشەسازیدا بایەخێکی زۆری هەیە ؟**

چونکە دەچێتە پیشەسازی ترشی گۆگردیک کە بە بناغەی ماددەی سەرەتایی( کەرەستەی خاو ) دادەنرێت بۆ گەلێک پیشەسازی کیمیاوی وەک پیشەسازی کاغەز و لاستیکی دەستکرد و تەقەمەنی و ئاوریشمی دەستکرد و بۆیە .

**گۆگردی سروشتی لە ڕووی پێکهاتنیەوە دەکرێت بە دوو بەشەوە :**

١- گۆگردی گڕکانی : ئەم جۆرە لە ناوچە گڕکانەکاندا زۆرە و بە دەوری کانیە گەرمە گڕکانیەکاندا لەملا و لەولای گڕکانەکاندا دەنیشێت ، وەک لە چیای ئەندیز و ژاپۆن و ئالاسکا .

٢- گۆگردی بەردی نیشتو : لە چینە نیشتووەکاندا هەیە کە لەوانەیە قوڵایی لە (١٠٠٠) پێ زیاتر بێت لە ڕووی زەویەوە ، وەک لە ویلایەتی لویزیانا و تەکساس و لە دوورگەی صقلیە هەیە .

**پوختەکردنی گۆگرد** : چەند ڕێگەیەک بۆ پوختەکردنی گۆگرد هەیە ، کە گرنگترنیان :

١- ڕێگەی چاڵی کراوە ( هەڵکەندن )

٢- ڕێگەی فراش ( گۆگرد دەرهێنان بەهۆی بیرەوە )

٣- پوختەکردنی لە گازی سروشتیەوە .

٤- پوختەکردنی لە ئەلبیریت ( گۆگردیدی ئاسن )

٥- پوختەکردنی لە گەچ .

هێرمان فراش : ئەو زانایە بوو کە بە داهێنەری ڕێگەی فراش ( گۆگرد دەرهێنان بەهۆی بیرەوە ) دادەنرێت کە لە ساڵی ١٨٩٤ دایهێناوە و بە باوترین ڕێگەکانی پوختەکردنی گۆگرد دادەنرێت و پشت بە دوو ڕاستی سەرەکی دەبەستێ : (١) تواندنەوەی گۆگرد بەهۆی ئاوی گەرم بە پلەی گەرمی زیاتر لە (١١٨) پلەی سەدی . (٢) پاڵ پێوەنانی گۆگردە تواوەکە بەهۆی بۆری هەروەک چۆن پاڵ بە ئاو و نەوت دەنرێ .

## دابەش بوونی جوگرافی گۆگرد لە جیهاندا :

١- وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا .

٢- ڕوسیای فیدراڵ: وەك لە چیاکانی ئۆراڵ .

٣- ژاپۆن: وەك لە ( دوورگەی هۆکایدۆ ) و ( دوورگەی هۆنشۆ ) .

٤- ئیتالیا : لەو پەڕی باشووری ئیتاڵیا و دوورگەی ( صقلیة ) .

٥- پۆلەندا .

٦- مەکسیك .

هۆ/ قارەی ئەوروپا پشت بە ( ئەلبیریت ) دەبەستێت بۆ بەدەست هێنانی گۆگردی پێویست لە پیشەسازی ؟

و/ چونکە زۆر بە فراوانی لە قارەکەدا بڵاوبۆتەوە و ئیسپانیا بە تەنیا ٥٠٪ ی یەدەگی جیهانی هەیە .

## دابەش بوونی جوگرافی گۆگرد لە عێراق :

١- گۆگرد بە شێوەی نیشتووی دیار لە بەردەکانی سەر ڕووی زەویدا هەیە وەك لە ناوچەی موصل و فە تحە وهیت،ولە کەرکوك و کفری .

٢- گۆگرد لەگەڵ بیرە نەوتەکان و کانەکانی گازی سروشتیدا هەیە لە پارێزگای کەرکوك .

٣- لەگەڵ بۆنە گۆگردیەکاندا لە ئاوی کانی و گەراوەکاندا هەیە هەروەك لە عین کبریت وحمام العلیل ( موصل ) وشثاثة و الرحالیة .

فۆسفات : فۆسفات لەو بەردە گرنگانە دادەنرێت کە لە پیشەسازی پەیینی کیمیاوی سوودی لێ وەردەگیرێت ، ئەوەی ڕووەك پێویستی پێیەتی لەو بەردانە توخمی فۆسفۆرە ، ئەم توخمەش لە سروشتدا دەگمەن نیە بەڵام بۆ ڕووەك زەحمەتە پوختەی بکات و سوودی لێ وەربگرێت .

هۆ/ دەرکەوتنی گرنگیی فۆسفات لە ساڵانەی دواییدا ؟

و/ لە ئەنجامی پێویستی زۆری مرۆڤ بۆ کەرەستەی خۆراك ، کە بێگومان ئەو زیاد بوونە زۆرەی ژمارەی دانیشتوانی جیهان پێویستی بە زیاد کردنی بەرهەمی کشتوکاڵەوە هەیە کە ئەمەش لە ڕێگەی زیادکردنی بەرهەمداریی زەویەوە دێتەدی بە پەیین پێوە کردنەوە کە لە فۆسفاتەوە دروست دەکرێت .

## بەرهەمی فۆسفاتی جیهانی

فۆسفات لە سێ ناوچەی سەرەکیدا لە جیهاندا کۆبۆتەوە،وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا و وڵاتانی عەرەبی و ڕوسیای فیدراڵ،وڵاتانی عەرەبی لە بەرهەمهێنان بە پلەی دووەم دێت لەدوای وڵاتە یەکگرتووەکان ،لە ناویشیاندا وڵاتی ( مەغریب ) بە پلەی یەکەم دێت و لە نێو وڵاتانی جیهانیشدا بە پلەی سێیەم دێت.گرنگترین ناوچەی فۆسفات لە مەغریب بریتین لە ( خریبکە ) لە باشوری خۆرهەڵاتی دارالبیضاء و ( بیابانی خۆرئاوا ).لە ( تونس ) یش لە لاپاڵی شاخەکانی ( شط الجرید ) و ناوەراستی تونس دا هەیە .لە ( دۆڵی نەقەب و دۆڵی عەرەبە )ی خۆرهەڵاتی ( فەلەستین ) ،و لە باکوری خۆرهەڵاتی عەممان لە ( ئوردون ) یشدا هەیە،لە ( میسر ) یش لەکەنارەکانی دەریای سوور ، ولە ( سوریا ) ش لە تەدمور دەردەهێنرێت.بەڵام لە عێراق ،لە ئەنجامی پشکنینی جیۆلۆجی دەرکەوتووە کە فۆسفاتێکی زۆر لە ناوچەی ( عەکاشات ) هەیە لە دووری ٩٠ کم لە باکوری ڕوتبە،یەدەگی ئەم ناوچەیە نزیکەی ٢٠٠٢ ملیۆن تەنە،بۆ بەرهەمهێنان ودروستکردنی فۆسفات لە شاری قائیم دامەزراوە کە بە بەردی بناغەی یەکەم پیشەسازی پەیینی کیمیاوی دادەنرێت.

# هەڵبژاردنەکانی بەشی پێنجەم / کانزاو کانزاکاری

١. لە نمونەی فلزە دارشتەکان : (گۆگرد – پۆتاسیۆم – نیکل – بازلت).
٢. ماگناتایت پێشی دەڵێن ئاسنی مەگناتیس وڕێژەی ئاسنە پوختەکەی دەگاتە : (٦٠,٥٪ – ٧٠,٥٪ – ٧٢,٥٪ – ٧٥,٥٪ ).
٣. کانە زێڕەکانی میسۆر دەکەوێتە وڵاتی : (باشوری ئەفریقیا – کۆنگۆی دیموکراتی – زامبیا – هیندستان).
٤. لە نمونەی فلزە ئاناسنینەکان : (نیکل – بازلت – مەنگەنیز – مس).
٥. لە گرنگترین ناوچەی بەرهەمهێنانی ئاسن لە بەریتانیا : (یۆرکشایەر – وێڵز – کلیفلاند – سکۆتلەندا ).
٦. فافۆنی پاک وبێگەرد لەسروشتدا نیە،بەڵکو لەناو فلزە زۆرەکاندا هەیە وەکو : ( نیس – زینک – کورۆم- جیری).
٧. کانەکانی ڕەند بۆ زێڕ دەکەوێتە وڵاتی : (جامایکا – باشوری ئەفریقیا – هیندستان – شیلی).
٨. ئەو وڵاتەیە کەلەکاتی ئێستادا پلەی یەکەمی وەرگرتووە لە بەرهەمهێنانی بۆکسایت :
(غینیا – جامایکا – فەرەنسا –ئوسترالیا).
٩. لە نمونەی کانزا نافلزەکان : (نیکل – فورفوشم – زینک – فۆسفات).
١٠. یەکەم کانزابووە کەسەرنجی ئادەمیزادی ڕاکێشاوە ولەژیانی کرداری خۆیدا سوودی لێ وەرنەگرتووە :
(زێڕ– تەنەکە – مس – ئاسن).
١١. فافۆنی پاک وبێگەرد لەسروشتدا نیە،بەڵکو لەناو فلزە زۆرەکاندا هەیە وەکو :
( گۆگرد – فورفوشم - تەنگستن- بۆکسایت).
١٢. ناوچەی میساپی لەرۆژئاوای دەریاچەی سوپەریۆر لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا باشترین نمونەیە بۆ دەرهێنانی :
(ئەلەمنیۆم – مس – ئاسن – گۆگرد).
١٣. هیماتایت بە ئۆکسیدی ئاسن دادەنرێت و ڕەنگی سوورە و ڕێژەی ئاسنە پوختەکەی دەگاتە :
(٤٢٪ – ٦٠٪ – ٧٢,٥٪ – ٧٠٪).
١٤. بەردە بەنرخەکان یان بەردە دەگمەنەکان یەکێك لەمانە دەگرێتەوە : (زێڕ – ئەلماس – زینک – مەنگەنیز).
١٥. زۆربەی بەرهەمی ئاسن لە فەرەنسا دەردەهێنرێت دەردەهێنرێت لە کانەکانی :
(کلیفلاند – لۆرین – کزباس – مەنشوریا).
١٦. تا ساڵی ١٨٨١ یەکەم وڵاتی جیهان بوو لەبەرهەمهێنانی مس،بەڵام ئێستا پلەی سێیەمی هەیە :
(زامبیا – ژاپۆن – کەنەدا – شیلی).
١٧. زۆربەی بەرهەمی مس لە کەنەدا دەکەوێتە کانەکانی : (ئۆنتاریۆ – سانت ئەلیزابێث – نۆرماندی – کریفۆری رۆج ).
١٨. ئەوکانزایەی کە پوختەدەکرێت لە پێکهاتووە نیشتووەکاندا وبە ڕێگەیەکی کۆن وئاسان دێتەدی وسەرمایەیەکی زۆریشی ناوێ :
(ئاسن – فورفوشم – یۆرانیۆم – پلاتین).
١٩. ئەو جۆرە ئاسنەی لە قۆناغی یەکەمی پوختەکردنیدا دست دەکەوێ پێی دەڵێن ئاسنی :
(گونجاو - زەهر – پۆڵا –مەگناتیسی).
٢٠. ژاپۆن بە پلەی دووەم دێت لەبەرهەمهێنانی مس لەجیهاندا و زۆربەی بەرهەمەکەی دەردەهێنرێ لەدوورگەی :
(هۆکایدۆ – ئۆکیناوا – کیوشو –کورێل).
٢١. ئەو دەوڵەتەی بە پلەی دووەم دێت لەبەرهەمهێنانی ئاسن لەجیهاندا :
(روسیای فیدراڵ – ئۆکرانیا –ئوسترالیا – کەنەدا ).
٢٢. ئەودەوڵەتەی ئاسن لەدەرەوە دەهێنێت بۆپڕکردنەوەی پێویستی پیشەسازیە پێشکەوتوەکەی:
(سوید–ڤەنزوێلا– فەرەنسا–ئەڵمانیا).

٢٣. ڕێگەی فراش بە باوترین ڕێگەکانی پوختەکردنی : ( **گۆگرد** – فۆسفات – زێڕ – بۆکسایت ) دادەنرێت لەجیهان.

٢٤. لیمۆنایت ڕەنگەکەی لەنێوان زەردو قاوەییدایە گرنگترین مەڵبەندەکانی دەرهێنانی ئەم جۆرە ئاسنە دەکەوێتە ناوچەی :

( مەنشوریا لەچین – کلیفلاند لە بەریتانیا – **لۆرین لە فەرەنسا** – کیمانۆ لە کەنەدا ).

٢٥. زۆربەی ئاسنی دەرهێنراوەکەی سوید لە جۆری : ( پایرایت – هیماتایت – **ماگناتایت** – سیدرایت ) ە .

٢٦. جامایکا سێیەم دەوڵەتە لەبەرهەمهێنانی بۆکسایت لە جیهاندا وبەناوبانگترین ناوچەکانی دەکەوێتە :

( **سانت ئەندو** –دورگەی کاسا – کۆناکری – ئۆنتاریۆ ).

٢٧. بە تێکەڵ کردنی مس لەگەڵ تەنەکە کانزای : ( زێڕ – مسی زەرد – **برۆنز** – زیو ) دروست دەبێت.

٢٨. ئاسنی ناوچەی کیرۆنا چلفاری لە سوید دەردەهێنرێت بە ڕێگەی کانزاکاری:

( **کانی کراوە** – بیری قووڵ – پوختەکردن لە پێکهاتووە نیشتووەکاندا – تونێل ).

٢٩. کانزای زۆر دەوڵەمەند هەیە بەڵام شوێنە جوگرافیەکەی یارمەتی وەبەرهێنانی نەداوە ئەوەی لەم ڕێسایە دەردەچێت :

( **زێڕە** – مس – زیو – پلاتین ).

٣٠. کانزاکان زۆرن و ژمارەیان لەکاتی ئێستادا گەیشتۆتە نزیکەی ٧٥ کانزا ،هەندێك لەوکانزایانە بایەخێکی زۆریان لە ژیانی مرۆڤدا هەیە وەك : ( **ئاسن** –خەڵووز – قورقوشم – تەنەکە ).

٣١. ئەو کانزایەی تا ساڵی ١٨٨٦ بەرهەمهێنانی ئابووریانە نەبوو : ( **ئەلەمنیۆم** – مس – ئاسن – گۆگرد ).

٣٢. ڕێگەی کانزاکاری بەشێوازی بیری قووڵ بەکاردێت بۆ دەرهێنانی نیشتووی کانزا کەلەڕووی توێژاڵی زەوی دوورەوەك دەرهێنانی کانزای:

( ئاسن – **زێڕ** – مس – نەوت ).

٣٣. بەرهەمهێنانی ڕووی لە زیادی کرد بەهۆی بەکارهێنانی زۆری لە لە پیشەسازی جەنگی و کارەباییدا :

( ئەلەمنیۆم – فۆسفات – **مس** – ئاسن ).

٣٤. لەو بەردە گرنگانە دەژمێردرێت کەلە پیشەسازی پەیینی کیمیاوی سوودی لێ وەردەگیرێت :

( ئەڵماس –**فۆسفات** – فەیروز – لم ).

٣٥. دەرکەوتووە ئەو ئەیزەکانەی لە بۆشایی دەرەوە هاتوون کانزای : ( ئاسن – **گۆگرد** – کرۆم – خەڵووز) یان تێدایە.

٣٦. چەشنێکی خراپ وبەدی خاوی ئاسنە خڵتەی زۆرە و گۆگرد و مسی زۆری تێدایە :

( **پایرایت** – لیمۆنایت – ماگناتایت – سیدرایت ).

٣٧. ئەوناوچانەی کە زۆر وشکن ئاووهەوا یارمەتی داوەبۆ پێکهاتنی عەماری گەورەی:

( **نیتراتی سۆدیۆم**– جیسۆم– نایترۆجین-بۆکسایت ).

٣٨. لەو وڵاتانەی بۆکسایت لەدەرەوە دەهێنن وبەشێوەی کەلوپەلی دروستکراو دەینێرنەدەرەوە :

( **کەنەدا**–جامایکا – دۆمنیکان–سۆرینام ).

٣٩. ناوچە سەرەکیەکانی بەرهەمهێنانی ئاسن لەجیهاندا لەهەمان کاتدا ناوچەی سەرەکین بۆ بەرهەمهێنانی :

( گازی سروشتی –نەوت – یۆرانیۆم – **خەڵوزی بەردین** ).

٤٠. کانزایەکە دەتوانرێ دووبارە بتوێنرێتەوە ئەمەش یاریدەی پاراستنی خاوەکانی دەدات :

( ئاسن – ئەلەمنیۆم – **مس** – توتیا ).

٤١. ڕێژەی ٤٠٪ ی بەرهەمی جیهانی مس دەچێتە پیشەسازی : ( ئۆتۆمبیل - **تێکەڵە جیاوازەکان** – جەنگی – کارەبایی ).

٤٢. دۆزینەوەی بەسەرەتای چەرخێکی تازەدانراوە لەژیانی مرۆڤدا،چونکە جێگای بەردی گرتەوە:

( **مس**–زیو–ئاسن–نیکل ).

٤٣. بە پێشەنگی وڵاتە بەرهەمهێنەکانی گۆگرد دادەنرێت لەجیهاندا:

( مەکسیك–عێراق–بەلجیکا–**وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا** ).

٤٤. رەنگەکەی سوورە وبەئۆکسیدی ئاسن دادەنرێت،ریژەی ئاسنە پوختەکەی ٧٠٪ دەبێت :
(سیدرایت-ماگناتایت-هیماتایت-لیمۆنایت).

٤٥. خاوەکانی بۆکسایت وباشی جۆرەکەی پشت دەبەستێت بە باری : (رامیاری-ئاووهەوا-ئادەمی-ئابووری).

٤٦. بەرهەمی کانە ئاسنەکانی :
(لۆرین-کلیفلاند-نۆرماندی-کۆزنتسک) لە فەرەنسا نزیکەی نیوەی بەرهەمی کیشوەری ئەوروپا دەبێت.

٤٧. زۆربەی بەرهەمی مسی زامبیا لەرێگەی بەندەری :
(ئارڤك -نیزمیت-بیرا- باتوم)لە مۆزەمبیق دەنێردرێتە ولاَتانی دەرەوە.

٤٨. بریتیە لە تێکەڵێکی سروشتی کەلەدوو کانزا یان زیاتر پێکهاتووە :
(بەرد-کانزا-سوتەمەنی-فلزە دارشتەکان).

٤٩. ئەوکانزایانەن کەلەکاتی پوختەکردنیان بەوە جیادەکرێنەوە کە نەرمن وبریسکەدارن وگەرمی وکارەبا باش دەگەیەنن :
(کانزافلزیەکان – سوتەمەنی کانزا- کانزا نافلزەکان- بەردە بەنرخەکان).

٥٠. ئەو چەشنە ئاسنەی کەلە ناوچەکانی بەردی ئاگرین و گۆڕاو دا هەیە :
(هیماتایت-ماگناتایت-لیمۆنایت-سیدرایت).

٥١. لە هەموو جۆرەکانی تری ئاسن زیاتر بەکاردێت چونکە زۆر رەقە :
(ئاسنی مەگناتیس-ئاسنی گونجاو-ئاسنی زەهر- پۆلا).

٥٢. لە نمونەی بەردە بەنرخەکان (بەردە دگمەنەکان) وەك : (نیس – بازلت – فەیروز – گرانیت).

٥٣. پۆلا لەسێیەم قۆناغی پوختەکردنی ئاسن دا دەست دەکەوێ دوای ئەوەی ئاسنی گونجاو ریژەیەك لە :
(تەنگستن –مەنگەنیز-نیکل –تۆتیا) ی لەگەڵ تێکەڵ دەکرێت.

٥٤. لە نمونەی کانزا نافلزەکان : (ئاسن – مس – زینك – پۆتاسیۆم).

٥٥. چەشنێکی خراپ وبەدە لەئاسن چونکە ریژە ئاسنە پوختەکەی ٤٢ ٪ دەبێت :
(پایرایت –سیدرایت –لیمۆنایت – هیماتایت).

٥٦. ولاَتێکە بەتەنها ٥٠٪ ی یەدەگی ئەلبیریت (گۆگردیدی ئاسن) ی هەیە لەجیهاندا :
(روسیای فیدرال – بەریتانیا – ئۆکرانیا – ئیسپانیا).

٥٧. پلەی یەکەمی وەرگرتووە لە بەرهەمهێنانی بۆکسایت کەلە ساڵی ١٩٩٤ دا لەنێو ولاَتانی جیهاندا بەرهەمەکەی گەیشتە ٣٦,٥٪ ی بەرهەمی جیهانی : (غینیا – جامایکا – سیرالیۆن – ئوستralیا).

٥٨. رێگەی کانزاکاری لەکانە کراوەکان بە رێگەیەکی ئابووری دادەنرێت چونکە :
(A-لەنزیك بازارە B-پێویستی بەئاووهەوایەکی دیاریکراو نییە
C- خەرجی بەرهەمهێنانی کەمە D-گواستنەوەی ئاسانە).

٥٩. کرداری پوختەکردنی فلزی مس لەخلتە ئەنجام دەدرێت لەنزیك :
(بازاڕەکان – کانەکان – سەرچاوەکانی وزە – هۆیەکانی گواستنەوە).

٦٠. رێژەی ئاسن لە لە توێکڵی زەوی دا دەگاتە : (A- ٥٪ B- ٥٠٪ C- ٢٥٪ D- ١٥٪).

٦١. گرنگترین کانەکانی ئاسنە لە ولاَتی سوید کە دەکەوێتە باکووری ولاَت :
(کریڤۆری رۆج – کیرۆناجالفاری – نیوفاوندلاند- درم).

٦٢. بە یەکێك لە کانزا فلزیەکان دادەنرێت : (پۆتاسیۆم – ئاسن – فۆسفات – بازلت).

٦٣. سێیەم دەوڵەتە لە بەرهەمهێنانی بۆکسایت لە جیهاندا :
(کۆنگۆ – ئوستralیا – غینیا – جامایکا).

٦٤. ڕێگای فراش ( بەهۆی بیردوە ) ڕێگایەکە بۆ پوختەکردنی :
( **گۆگرد** – مس – ئەلەمنیۆم – فۆسفات ).

٦٥. ڕێژەی ئاسنی سیدرایت لە خاوەکەیدا دەگاتە : ( **٤٨٪** – ٤٢٪ – ٤٤٪ – ٤٦٪ ).

٦٦. ڕێژەی کانزاکەی دەبێت ١,٥ – ٢٪ ی خاوەکەی بێت ئنجا لەڕووی ئابووریەوە بەرهەمهێنانی باشە :
( نیکل – بۆکسایت – قورقوشم – **مس** ).

٦٧. یەکێکە لە ماددە هایدرۆکاربۆنیەکان : ( نەوت – بەردەبارانی – گازی سروشتی – **هەموو وەڵامەکان ڕاستن** ).

٦٨. یەکێکە لە کانزا فلزییەکان کە ٥ ٪ ی مادەکانی توێکڵی زەوی پێك دەهێنێت : ( **ئاسن** – مس – گۆگرد – ئەلەمنیۆم ).

٦٩. خەڵوز و نەوت لەوناوچانەدا هەن کە پێکهاتووە لە لەبەردی :
( A- **نیشتوو** B- ئاگرین C– گۆڕاو D– هیچ کامیان ڕاست نین ).

٧٠. ئاسن وس لەوناو ناوچانەدا هەن کە پێکهاتووە لە بەردی :
( A-نیشتوو B- گۆڕاو **C- ئاگرین** D- هەموو وەڵامەکان ڕاستن ).

٧١. زێڕ وزیو وقورقوشم لەوناوچانەداهەن کە پێکهاتووە لە بەردی :
( A-نیشتوو B- ئاگرین C- گۆڕاو **D- هەریەکە لە AوC ڕاستە** ).

٧٢. پلەی گەرمی پێویست بۆ تواندنەوەی گۆگرد بە ڕێگای فراش بە هۆی ئاوی گەرم بریتیە لە :
( ١٠٨ پلەی سەدی – **١١٨ پلەی سەدی** – ١٠٠ پلەی سەدی – ١٠٤ پلەی سەدی ).

٧٣. کارگەکانی ئەم ناوچەیە پشت بەو ئاسنە دەبەستن کەلە ناوچەی کریفۆری ڕۆج بەرهەمدەهێنرێت لەباشوری ئۆکرانیا :
( خۆرئاوای ئەوروپا – خۆرئاوای ئاسیا – **خۆرهەڵاتی ئەوروپا** – خۆرهەڵاتی ئاسیا ).

٧٤. قۆناغی جیاکردنەوەی ئۆکسجین لە ئۆکسیدی فافۆن بۆ ئەوەی کانزایەکی پاکی لێ بەرهەم بێت دەکەوێتە نزیك :
( بەندەرەکان – شارە گەورەکان – **سەرچاوەی ووزە** – ڕێگا سەرەکیەکان ).

٧٥. تەنیا پێش چەند ساڵێك دەست کراوە بە بەرهەمهێنانی ئاسن لە بەرازیل بە هۆی :
( کەمی بڕی یەدەگ – کەمی ڕێژەی کانزا لەخاوەکەیدا – **زۆری تێچوونی گواستنەوە** – ئاووهەوای گەرم ).

٧٦. قۆناغی پاڵاوتن بۆ بەدەستهێنانی کانزای مس ئەنجام دەدرێت لە نزیك :
( ڕێگاکانی گواستنەوە – بازاڕەکان – **سەرچاوەکانی ووزە** – دەستی کارگەری هونەری ).

٧٧. ڕێژەی ئاسنەکەی ٦٠ ٪ ی خاوەکەیەتی و مەڵبەندە گرنگەکانی دەکەونە ناوچەی لۆرین لە فەرەنسا :
( **لیمۆنایت** – پایرایت – هیماتایت – سیدرایت ).

٧٨. بە گرنگترین ناوچەی پیشەسازی دادەنرێت لە روسیای فیدراڵ :
( کیرۆنا جالفاری – کریفۆری رۆج – **ماگنیتۆ کۆرسك** – کۆزنتسك ).

٧٩. گۆگرد لە عێراق لەگەڵ بیرە نەوتییەکان و کانە گازە سروشتیەکاندا هەیە لە پارێزگای :
( موسڵ – **کەرکوك** – ئەنبار – دیالە ).

٨٠. لەوناوچانەدا زۆرە کەلەبەردی ئاگرین پێکهاتوون : ( **ئاسن** – نەوت – قورقوشم – خەڵوز ).

٨١. یۆنان لەم وڵاتانە هەژماردەکرێت کە هەڵدەستێت بە :
( **ناردنی کەرستەی خاوی بۆکسایت بۆدەرەوە** – هێنانی کەرستەی خاوی بۆکسایت لەدەرەوە
– ناردنی فافۆن بۆ دەرەوە – هێنانی فافۆن لە دەرەوە ).

٨٢. لە نمونەی فلزە دارشتەکان : ( کرۆم – مەنگەنیز – تەنگستن – **هەموو وەڵامەکان ڕاستن** ).

٨٣. بەکاردێت لە پیشەسازی دروستکردنی دینەمۆ و مەکینەکانی سووتانی ناوخۆیدا :
( **ئاسن** – گۆگرد – ئەلەمنیۆم – هەموو وەڵامەکان هەڵەن ).

٨٤. لە سروشتدا زۆرە بەڵام ناوچەکانی بەکارهێنانی بە شێوەیەکی ئابووری هێشتا کەمن :
(فۆسفات – مس – **گۆگرد** – ئاسن).

٨٥. چالاکی بازرگانی ئاسن لە جیهان دەگاتە ٣٠٪ لەبەر :
(هەبوونی ڕێگای گواستنەوەی هەرزان – پشت بەستن بە بارودۆخی ئاووهەوا –
هەبوونی ووزەی هەرزان – **ئەنجامدانی بازرگانیەکە لەچوارچێوەی وڵاتانی یەك کیشوەردا**).

٨٦. خاوەکانی مس لە کانەکانی کەنەدا بە ڕێژەیەکی بەرز کانزاکەیان تێدایە کە دەگاتە : (**٥٪** – ٤٪ – ٣٪ – ٢٪).

٨٧. لە خاسیەتەکانی مس : (پوختەکردنی ئاسانە – بەکارهێنانی پوختە – بەهاونرخی نزمە – **دەتوانرێ دووبارە بتوێنرێتەوە**).

٨٨. دەوڵەتێکە زۆربەی (مس) ی بەرهەمهێنراوی دەنێرێتە دەرەوە : (**زامبیا** – بەلجیکا – ئەلمانیا – ئیتالیا).

٨٩. دەورێکی باڵای هەیە لە پێکهاتنی عەماری گەورەی نیتراتی سۆدیۆم( خوێ) لە ناوچە بیابانەکانی شیلی و پیرۆ :
(**ئاووهەوا** – داماڵران – تەمەنی بەردومێژووە جیۆلۆجیەکەی – جوڵەی توێژاڵی زەوی).

٩٠. مەڵبەند کانزاکاریەکانی ئاسنی ماگناتایت دەکەوێتە :
(ناوچەی لۆرین لە فەرەنسا – خۆرهەڵاتی ئینگلتەرا – **باکوری سوید** – ئەوروپای خۆرهەلات).

٩١. بەرهەمی ئاسنەکەی دەگاتە ( ٥ ٪ ) ی بەرهەمی جیهانی و بەزۆری باکوری وڵاتدا کۆبۆتەوە :
(فەرەنسا – **سوید** – نەرویج – دانیمارك).

٩٢. هۆکاری پشت گوێ خستنی بەرهەمهێنانی کانەکانی خەڵوزی مەنشوریا بۆ ماوەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ :
(نەبوونی سەرمایەی پێویست – دووری مادده خاوەکە لە رووی زەوی
– **زۆری تێچوونی گواستنەوە** – کەمی ڕێژەی کانزا لەخاوەکەیدا).

٩٣. دووەم دەوڵەتە لە جیهاندا لە بەرهەمهێنانی بۆکسایت : (جامایکا – **غینیا** – ئوسترالیا – یۆنان).

٩٤. ( ٤٠ ٪ ) ی بەرهەمی جیهانی ئەم کانزایە دەچێتە ناو دروستکردنی تێکەڵە جیاوازەکان :
(ئاسن – برۆنز – **مس** – تۆتیا).

٩٥. یەکێکە لەو کانانەی کە زێڕی بەشێوازی بیری قوڵ لێ دەردەهێنرێت لە هیندستان :
(میسایی – **میسۆر** – رند – وەتەرساند).

٩٦. یەکێکە لە کانزا نافلزیەکان : (مەنگەنیز – نیکل – **مایکا** – تەنگستن).

٩٧. لە گرنگترین ناوچەکانی بەرهەمهێنانی ئاسن لە بەشی باکوری خۆرهەڵاتی بەریتانیا بریتیەلە :
(وێلز – نیوفاوندلاند – **کلیفلاند** – یۆرکشایەر).

٩٨. ئاووهەوای مەیلەوگەرم وشێدار( خولگەیی ونیمچە خولگەیی) کاردەکاتە سەر باشی جۆرەکەی :
( گۆگرد – فۆسفات – نیکل – **بۆکسایت**).

٩٩. لەم کانانەدا ( ٥ – ١٠ ٪ ) ی ئاسنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای لێ دەردەهێنرێت :
(**ویلایەتی ئەلەباما** – ویلایەتی واشنتۆن – ویلایەتی نیویۆرك – ویلایەتی کالیفۆرنیا).

١٠٠. بیابانی ئەتەگاما ناوچەیەکی گرنگی بەرهەمهێنانی (مس) ە لە :
(ژاپۆن – کەنەدا – **شیلی** – پیرۆ).

١٠١. ئیسپانیا بەتەنها : (٣٠٪ – ٤٠٪ – **٥٠٪** – ٦٠٪ ) ی یەدەگی جیهانی ئەلبیریت(گۆگردیدی ئاسن) ی جیهانی هەیە.

١٠٢. ١٠٪ ی زێڕی جیهان دەردەهێنرێت بە ڕێگای :
(کانزاکاری لەوکانانەی کە کراوەن – کانزاکاری بە ڕێگای بیری قووڵ – **کانزا پوختەکردن لە پێکهاتووە نیشتووەکان** – تونێل).

# بەشی شەشەم/ پیشەسازی

## گرنگترین ڕواڵەتی پیشەسازی نوێ ئەمانەیە :

١- هێزی مەکینە شوێنی هێزی بازووی گرتەوە ، ئەمەش پێویستی بەوە هەبوو سەرچاوەی هێزی بزوێنەری تەواو هەبێت .

٢- پێویستی بەوە ئەدەکرد کەوا کارگەکان بەند بێت بە شوێنی کەرەستە خاوەکانەوە ، ئەمەش بووە هۆی پەیدابوونی بازرگانیەکی فراوان لە جیهاندا بۆ ئەو کەرەستە خاوانەی کە پیشەسازیە هەمەجۆرەکان پشتی پێ دەبەستێت .

٣- بەرهەم بە شێوەیەکی فراوانە ، کە ئەمەش بووە هۆی ئاسان بوونی شارەزایی ( پسپۆری ) لە لقە هەمەجۆرەکانی پیشەسازیدا ، ئەم جۆرە بەرهەمەش پێویستی بە دامەزراندنی کارگەی زۆر مەزن هەیە کە ڕووبەرێکی فراوانی زەوی بگرێتەوە .

٤- دەرکەوتنی چینێك لە کرێکاران کە بەستراون بە سەندیکا ( نەقابە )ی کرێکارانەوە کە قەوارەیەکی گرنگیان هەیە لەناو دەوڵەتە پیشەسازیە پێشکەوتووەکاندا .

## جۆرەکانی پیشەسازی :

### ١- پیشەسازی لەسەر بنەڕەتی سروشتی بەرهەمداریەکەی ، دەکرێت بە :

أ - **پیشەسازی دەرهێنان** : گشت چالاکیەکانی بەرهەمداریە کە بایەخ دەدات بە دەرهێنانی کەرەستەی خاو و کەرەستەی سووتەمەنی لەناو جەرگەی زەوی و ، لە ڕووبەرە ئاویەکان و لە جەنگەڵەکان ، وەك دەرهێنانی خەڵوز و نەوتی خاو و داربڕین .واتە ئەو چالاکیانەیە کە پەیوەندیان هەیە بە بەدەستهێنانی کەرەستەی خاو بەشێوەیەکی سروشتی.

ب- **پیشەسازی ئامادەکردن** : گشت ئەو کردارانەیە کە لەگەڵ کەرەستە خاوەکاندا دەکرێت وەك قۆناغێکی ئامادەکردن یاخود ڕێ خۆش کردن پێش گۆڕینی بۆ کەلوپەل یاخود شمەکی دروست کراو ، لەوانەشە ئەو کردارانە شێوەی ئەو ماددانە بگۆڕێت ، بۆ نموونە پێستە خۆش کردن ،وهاڕینی دانەوێڵە، و پارچە پارچە کردنی دار ، خەست کردنی مس .

ج- **پیشەسازی گۆڕانکاری**:ئەو پیشەسازیانەیە کەشێوەی خاوەکان دەگۆڕێت لەبارە ڕەسەنەکەیەوە بۆ بارێکی نوێ کە پێداویستی مرۆڤ پڕبکاتەوە، جا کانزایی یاخود کشتوکاڵی یاخود ڕووەکی یاخود ئاژەڵی بێت،وەك گۆڕینی خوری خاو بۆ چنراو،ئاسن بۆ ئامێرومەکینە .

### ٢- پیشەسازی لەسەر بنەڕەتی مولکایەتی ، دابەش دەکرێت بۆ :

أ- بواری گشتی ب- بواری تایبەتی ج- بواری تێکەڵ د- بواری بیگانە .

### ٣- پیشەسازی لەسەر بنەڕەتی چۆنێتی بەرهەمە پیشەسازیەکە ، دەکرێت بە :

أ - **پیشەسازی بنەڕەتی** : وەك پیشەسازی ئاسن و پۆڵا ، و پیشەسازی بەدەست هێنانی ووزەی کارەبا و ، پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت ،چیمەنتۆ ،کە خاسیەتی ئەوەیە : غازات و دووکەڵ و بۆنی ناخۆش دەردەدەن ئەمەش دەبێتە هۆی پیس کردنی ژینگە و بێزارکردنی دانیشتوان .

ب- **پیشەسازی بەکاربردن** : ئەو پیشەسازیەیە کە شمەکی بەکاربردن بەرهەم دێنێ کە مرۆڤ بەکاری دەهێنێ ، وەك پیشەسازی کەلوپەلی ناوماڵ و، پێڵاو و، جل وبەرگی ئامادەکراو .

### ٤- پیشەسازی لەسەر بنەڕەتی قەبارەی سەرمایە و جۆری بەرهەمهێنان، دابەش دەکرێت بۆ :

| پیشەسازی قورس | پیشەسازی سووك |
|---|---|
| أ- پێویستی بە بڕێکی گەورە هەیە لەکەرەستەی سەرەتایی . | أ- پێویستی بە بڕێکی کەم هەیە لە کەرەستەی سەرەتایی . |
| ب- پێویستی بە سەرمایەیەکی مەزن هەیە . | ب- پێویستی بە سەرمایەیەکی کەم هەیە . |
| ج- ئامێر و مەکینەی مەزن بەرهەم دێنێت . | ج- ئەو شمەکەی بەرهەمی دێنێت کێشی سووکە . |
| د- ژینگە پیس دەکات . | د- ژینگە پیس ناکات . |
| هـ- وەك پیشەسازی ئاسن و پۆڵا و ، دروست کردنی مەکینە . | هـ- وەك پیشەسازی جل و بەرگ و چنراو ( المنسوجات ). |

٥- پیشەسازی لەسەر بنەڕەتی سەرچاوەی کەرەستەی سەرەتایی کە پشتی پێ دەبەستێ ، دابەش دەکرێت بۆ :

أ- ئەو پیشەسازیانەی کە پشت دەبەستن بە کەرەستەی کشتوکاڵی .

ب- ئەو پیشەسازیانەی کە پشت دەبەستن بە کەرەستەی سەرەتایی ئاژەڵی .

ج- ئەو پیشەسازیانەی کە پشت دەبەستن بە کەرەستەی ڕووەکی سروشتی

د- ئەو پیشەسازیانەی کە پشت دەبەستن بە کەرەستەی سەرەتایی کانزایی .

ه- ئەو پیشەسازیانەی کە پشت دەبەستن بە کەرەستەی دروست کراو .

٦- پیشەسازی لەسەر بنەڕەتی ئەو هۆیانەی کە کاردەکەنە سەر جێگیر بوونیەوە ، دابەش دەکرێت بۆ :

أ- پیشەسازیە ئاراستەکراوەکان بەرەو کەرەستە سەرەتاییەکان ، وەك پیشەسازی شەکر و قوتو .

ب- پیشەسازیە ئاراستەکراوەکان بەرەو بازاڕ ، وەك پیشەسازی مۆبیلیات و جل و بەرگی ئامادەکراو .

ج- پیشەسازیە ئاراستەکراوەکان بەرەو دەستی کارگەران ، وەك پیشەسازی چنین ( چنراو ) و سەعات .

د- پیشەسازیە ئاراستەکراوەکان بەرەو سووتەمەنی و سەرچاوەکانی ووزە ، وەك پیشەسازی ئەلەمنیۆم .

ه- پیشەسازیە ئاراستەکراوەکان بەرەو ڕێگاکانی گواستنەوە و هاتوچۆ ، وەك پیشەسازی کەشتی .

هۆیەکانی جێگیر بوونی پیشەسازی ( بنەماکانی دامەزراندنی پیشەسازی ) :

گرنگترین هۆ کە کار لە دامەزراندنی پیشەسازی دەکات ئەمانەن :

① کەرەستەی سەرەتایی ( کەرەستەی خاو ). ② سووتەمەنی و سەرچاوەکانی ووزە. ③ سەرمایە. ④ بازاڕ. ⑤ کار ( کرێکار ).

⑥ هاتوچۆ و گواستنەوە. ⑦ زەوی و ئاو. ⑧ شوێنی جوگرافی وئاووهەوا . ⑨ سیاسەتی حکومەت ( ڕامیاری میری ) .

کەرەستەی سەرەتایی ( کەرەستەی خاو ) : ئەو کەرەستانەن کە پێداویستی هەمەجۆری مرۆڤیان لێ دروست دەکرێت ، کە لەوانەیە کشتوکاڵی بێت وەك لۆکە و قامیشی شەکر ، لەوانەشە ئاژەڵی بێت وەك پێستە و شیر ، لەوانەشە کانزای فلزی بێت وەك ئاسن و مس ، یاخود کانزای نافلزی بێت وەك فۆسفات و گۆگرد .

کەرەستەی نیوە دروست کراو : ئەو کەرەستانەن کە هێشتا تەواو دروست نەکراون ، وەك ڕۆن و چنراوی لۆکە و خوری و ، ئاسنی زەهر ، کە ئەمانە دەچنە پیشەسازی ترەوە .

هۆ/ هەندێك ناوچەی پیشەسازی هەن کە زۆر کەرەستەی سەرەتایی تێدا نیە کەچی پێشکەوتوون وەك ژاپۆن ؟

چونکە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا لە هۆیەکانی گواستنەوەدا لە ڕووی خێرایی و فراوان بوونیەوە ، بۆتە هۆی کەمکردنەوەی تێچوونی گواستنەوە لەلایەك و ، لەلایەکی تریشەوە بۆتە هۆی ئاسان گواستنەوەی کەرەستەی سەرەتایی( خاو ) .

کەرەستەی خاو ، ئەوەی کە کاردەکاتە سەر هەڵبژاردنی شوێنی پیشەسازی ، دابەش دەکرێت بۆ :

أ- کەرەستە خاوە زوو لەناوچووەکان ( زوو تێکدەچن ) وەك سەوزە و سپیایی و ماسی و میوە .

هۆ/ کارگەکانی لەقوتونانی میوە و سەوزە و سپیایی و ماسی بە زۆری لە نزیك شوێنی بەرهەم هێنانەکانیان دادەمەزرێن ؟

چونکە زوو تێکدەچن و خاسیەتەکەیان نامێنێ بە درێژبوونەوەی ماوە ، بۆیە گواستنەوەی دوور و درێژ و لەسەرخۆ هەڵناگرن .

ب- کەرەستە خاوەکانی کە دەچنە پیشەسازیەوە بە بڕی قەبارەی گەورە و کێشی قورسەوە ، وەك بەردی قسڵ کە دەچێتە پیشەسازی چیمەنتۆ ، بەزۆریش نزیك خاوەکە دادەمەزرێت .

ج- کەرەستە خاوەکە بە کێش قورس و بە قەبارە گەورەن بەڵام پاش پیشەسازی ( دروست کردن ) قەبارە و کێشیان زۆر کەم دەکات ، وەك پیشەسازی خەست کردنی مس کە دەبێت لە نزیك کانەکانەوە بێت .

د- کەرەستە خاوە کێش سووك و ئاسان گواستراوەکان ، وەك پیشەسازی لۆکە و خوری و پاڵاوتنی نەوت ، کەمەرج نییە پیشەسازیەکانی لە نزیك ناوچەی بەرهەمهێنانیەوە بێت ( یاخود لەو دەوڵەتانە بێت کە خاوەکە بەرهەم دەهێنێت ).

**سوتەمەنی** : بریتیە لە هەر کەرەستەیەك کە لە کاتی سووتاندنیدا ئاگری لێ پەیدا ببێت وەك دار و خەڵوز و نەوت .

**ووزە** : ئەو توانا شاراوەیەیە کە لە هەر کەرەستەیەکدا هەیە بۆ جێبەجێ کردنی کارێك ، کە بـە چـاونابینرێت بـەڵام ئە نجامەکـەی بـە چەند شێوەیەك بەدیار دەکەوێت .

**بۆشایی** / ڕێژەی هەرەزۆری سەرچاوەی سوتەمەنی کە دەگاتە نزیکەی ٥/٣ بۆ پیشەسازی و ٥/١ بۆ گەرمکردنەوە و ٥/١ ی تریش بـۆ ڕووناك کردنەوە بەکاردەهێنرێت.

**بۆشایی** / هەندێك پیشەسازی پێویستی بە بڕێکی گەورە هەیە لە ووزەی کارەبای بەرز وەك **ئەلەمنیۆم** .

**هۆ/ نەوت وەك سەرچاوەیەکی ووزە کە جێگەی خەڵووزی گرتەوە لە زۆر لە پیشەسازیدا ، یارمەتی ئەوەی دا کە سەرچاوەکانی ووزە کارێکی ئەوتۆیان نەبێ لە دامەزراندنی پیشەسازیدا ؟**

چونکە نەوت بە ئاسانی دەگوازرێتەوە و گەورەترین کەرەستەی شلە کە ئێستاکەش چۆتە بواری بازرگانی نێوان دەوڵەتان .

**سەرمایە** : سەرمایە لە بارەی پەیوەندیەوە بە بەرهەم هێنان پێناسە دەکرێت کە سامانێکە بەدەست هاتووە لە ئە نجامی کارێکی لەوەو پێش ، و بەکاریش دێ بۆ بەرهەم هێنانی سامانێکی تر . **وە دەبێت جیاوازی بکرێت لەنێوان دووجۆر لەسەرمایە :**

| سەرمایەی نەختینە | سەرمایەی بەرهەم هێنراو ( جێگیر ) |
| --- | --- |
| ① ئەو پارە نەختینەیە کە بەکاردەهێنرێ بۆ دابین کردنی هۆیـەکانی تـری بەرهـەم هێنـان کـە پێویسـتە بـۆ دامەزرانـدنی پرۆژەیـەکی پیشەسـازی نـوێ ، یـاخود کـارپێکردنی یـاخود فـراوان کـردن و پـێش خـستنی پیشەسازیە دامەزراوەکە . | ① گشـت ئـەو شـتانە دەگرێتـەوە کـە سروشـتی نـین و بـە ڕاستەقینە بەکاردەهێنرێن بۆ بەرهـەم هێنـانی شـمەك و پێشکەشکردنی کارگوزاری، کەلەئـە نجامی کـارلێککردنی کارو سەرمایەی نەختینە دێتە کایەوە کە بینای کارگەکان و ئامێر و مەکینە و هۆیەکانی گواستنەوە دەگرێتەوە . |
| ② لەڕوویپیشەسازی بە جوڵاو( متحرك ) دادەنرێ و بەهای ناگۆڕێت بەگوێزانەوەی لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر . | ② لە ڕووی پیشەسازیەوە بـە ئـەگۆڕ( جـێگیر ) دادەنرێـت بەتایبەتی بینای کارگەکان و ئامێر و مەکینە گەورەکان . |

**هۆ/ ڕەوەنی ( کارپێکردنی ) سەرمایەی نەختینە بێ پایان نیە ، بەڵکو بەسـتـراوەتەوە بە چەند هۆیەك ؟**

① چاودێری دەوڵەتان، چونکە زۆربەی وڵاتانی جیهان کۆسپ (تەگەرە ) دەخەنە بەردەم گواستنەوەی سەرمایە بۆدەرەوەی سنورەکانیان.

② ئەم کردارە مەترسی تێدایە ( بەهۆی بەرز بوونەوە و دابەزینی نرخی دراو ) .

**هۆ/ زۆر جار سەرمایەی بیانی (بێگانە ) بە ترسنۆکی و دوودڵی وەسف دەکرێت ( پێناسە دەکرێت ) ؟**

چونکە سەرمایەی بیانی ( بێگانە ) لە هیچ وڵاتێکەوە ناگوازرێتەوە بۆ وڵاتێکی تر تا دڵنیا نەبێت لە ڕێـژەی بـەرزی قـازانج کـە دەسـتی بکەوێت ، هەروەها دڵنیا بوونیش لە سەقامگیری باری ڕامیاری و ئابووری گشتی ئەو وڵاتە .

**هۆ/ سەرمایەی بەرهەم هێنراو ( جێگیر ) دەورێکی سەرەکی هەیە بۆ ڕاکێشانی پیشەسازیە جیاوازەکان ؟**

چونکە لەسەر بەرووبوومی سانەوی ( لاوەکی ) ئەو کارگانە دامەزراوە یاخود لەسەر بوونی شارەزایی کرێکار .

**هۆ/ ناوچەی لەنکشایەر لە بەریتانیا لە پیشەسازی چنینی لۆکەوە گۆڕا بۆ پیشەسازی کارەبا ؟**

چونکە هەندێ کارگەی پیشەسازی هەن بۆ نموونە بەهۆی بـاری شـەڕ ئاڕوخێنرێـت ، بـەڵکو پیشەسـازی تـری هاوشـێوەی خـۆی جێگـای دەگرێتەوە یاخود هۆکاری تر ڕایدەکێشێت وەك شارەزایی کرێکار یاخود بازاڕ ، واتە ئەو ناوچـەیە پارێزگـاری لـە گرنگـی خـۆی وەك مەڵبەندێکی پیشەسازی هەر دەکات و بایەخی ناڧەوتێت .

**بازاڕ** : شوێنێکە بۆ کڕین و فرۆشتنی کەرەستەی سەرەتایی وکەرەستەی نیوەدروستکراو و ، بەرووبوومی تەواو ئامادەکراو و دروست کراو .

**لێکۆڵینەوە لە بازاڕ دوو لایەنی سەرەکی دەگرێتەوە :**

١- فراوانی بازاڕەکە، واتە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەوانەیە بازاڕەکە لەخۆی بگرێت بۆ کڕینی شمەکەکە یاخود شمەکە وەبازاڕخراوەکە .

٢- توانای کڕینی ئەو کەسانەیە لەو بازاڕەدا ، کە ئەمەش پەیوەندی بە ڕادەی ژیانیان ( ئاستی بژێوی ) هەیە .

هۆ/ تەنها ژمارەی دانیشتوان بۆ خۆی ئەوە دیاری ناکات کە قەبارەی بازاڕ چۆنە ؟

چونکە لەوانەیە دوو شار هەبن کە ژمارەی دانیشتوانیان وەك یەك یەکسانە ، بەڵام دوو بازاڕی وەك یەك یەکسان پێکناهێنن ، بۆنموونە بازاڕی ( دەکا ) لە بەنگلادیش بێگومان تەسکترە ( لاوازترە ) لە بازاڕی لەندەن هەرچەندە ژمارەی دانیشتوانیشیان لێك نزیکە ، ئەمەش بەهۆی نزمی ڕادەی ژیانی دانیشتوانی ( دەکا ) .

دەتوانرێت ئەو پیشەسازیانەی کە پەیوەندیەکی بەهێز دەیانبەستێتەوە بە بازاڕ ، دابەش بکەین بۆ ئەم کۆمەڵانە :

١- ئەو پیشەسازیانەی کە بەرهەمەکانیان زوو تێکدەچن ( زوو لەناو دەچن ) پاش دروست کردنیان ، وەك پیشەسازی بەروبوومی شیرەمەنی و سەهۆڵ ،بۆیە وا پێویست دەکات زوو بگەیەنرێنە بازاڕ.

٢- ئەو پیشەسازیانەی کە بەرهەمەکانیان زوو دەشکێ( بەتایبەتی لە کاتی گواستنەوە بۆ مەودای دوور ) وەك پیشەسازی شووشە و گلێنەسازی ،بۆیە وا پێویست دەکات لەبازاڕەوە نزیك بن.

٣- ئەو پیشەسازیانەی کە بەرهەمەکانیان قەبارە گەورەی هەرزان بەهان،وەك پیشەسازی خشت و گەچ ،بۆیە دەبێ لەبازاڕەوە نزیك بن.

٤- ئەو پیشەسازیانەی کە کرێکاری زۆری پێویستە وەك پیشەسازی یاری منداڵان و جلوبەرگ وکەلوپەلی ئارایشت .

هۆ/ ئەو ناوچانەی کە دانیشتوانی زۆرە ، دانیشتوان دوو دەور دەبینن بۆ جێگیر بوونی هەندێ پیشەسازی ؟

چونکەلەلایەکەوە چەند کرێکاری پێویست بێت دەیدات بە پیشەسازیەکە،لەلایەکی تریشەوە دەبنەبازاڕبۆ بەکاربردنی بەرهەمەکانی.

٥- ئەو پیشەسازیانەی کە پێویستیان بە ئەندازەیەکی کەمی کەرەستەی سەرەتایی هەیە و دەشتوانرێت بە ئاسانی بگوازرێتەوە بە تێچوونێکی گواستنەوەی هەرزان وەك پیشەسازی پلاستیك و کەلوپەلی کارەبایی ،کەمەرج نیە لەبازاڕەوە نزیك بێت.

٦- ئەو پیشەسازیانەی لە کێش و قەبارەی ئەو کەرەستە سەرەتاییانەی بەکارهێنراون تێیدا زیاد دەکات ، وەك پیشەسازی خواردنەوە غازیەکان و ساردەمەنی .

٧- ئەو پیشەسازیانەی کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەستنەوە بە بەکاربەرانی پێویستە بۆی ؟

چونکە زانینی ئارەزووی بەکاربەران پێویستە بۆ هەندێك پیشەسازی وەك جلوبەرگی ئامادەکراو، پێڵاو ،مۆبیلیات.

٨- ئەو پیشەسازیانەی کە کەرستە سەرەتاییەکە و بەرهەمەکەشی تووشی زوو لەناوچوون نابێت لە کاتی گواستنەوە ، هەروەها کێش و قەبارەی بەرهەمەکانی وەك کێش و قەبارەی کەرستە سەرەتاییەکەیەتی ، وەك پیشەسازی چنین .

٩- پیشەسازی خزمەتگوزاری گشتی وەك پیشەسازی چاکردنەوەی ئۆتۆمبێل و پاڵاوتنی ئاو و بەدەست هێنانی ووزەی کارەبا .

١٠- ئەو پیشەسازیانەی خزمەتی پیشەسازیەکانی تر دەکات ، یاخود ئەو پیشانەی کە بازاڕی پسپۆڕی خۆی بۆ تەرخان دەبێت ، وەك پیشەسازی چنین کە پیشەسازی ڕستن ڕایدەکێشێت .

کار : مەبەست دەستی کارگەران و کارگێڕیی ڕێکوپێکە .

پیشەسازیەکان بە پێی گرنگی کرێی کرێکاروجۆری ئیشەکە لە بڕیاردانی دەست نیشان کردنی جێگا،بەم جۆرە دابەش( پۆلێن ) دەکرێن :

١- ئەو پیشەسازیانەی کە لە جێگیر بوونیدا ( جێگایدا ) دابەش بوونی کارگەران کاری تێناکات ، چونکە لەوانەیە بە ئامێر و مەکینە ئیشەکە بکرێت وەك پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت ، یاخود هۆکاری تری وەك جێگاکەی ڕایدەکێشێت وەك کەرەستەی سەرەتایی ، نموونەش وەك پیشەسازی شەکر .

٢- ئەو پیشەسازیانەی بە پلەی یەکەم بایەخ دەدەن بە جۆری کار ، ئەمانەش دەست ڕەنگینی و شارەزایی و پسپۆڕیەکی ووردیان دەوێت وەك پیشەسازی سەعات و ئامێری مۆسیقا و ئامێری ئەلکترۆنی .

٣- ئەو پیشەسازیانەی کە بایەخ بەوە دەدەن ژمارەیەکی زۆری کرێکاریان هەبێت وەك پیشەسازی ئۆتۆمبێل و چنین .

گواستنەوە : ئەو ڕێگا و هۆوپێناوانەیە کە مرۆڤ و بەرهەمەکەی دەگوازنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر . ئەمەش ڕێگای ئۆتۆمبێل و هێڵی ئاسن و ڕێگای ڕووبارەکان ( بە دەریاچە و ئۆکەندەوە ) و ڕێگەی دەریایی و بۆری ( لوولە )ی گواستنەوەی نەوت و گازی سروشتی و ئاو ، گواستنەوەی ئاسمانی و ، تەنانەت ئەو سیم و تەلانەی کە ووزەی کارەبا دەگوازنەوە ، گشتی دەگرێتەوە .

هۆ/ پیشەسازی ئەو شوێنانە بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت کە هاتوچۆیان تێدا ئاسان و هەرزانە ، هەروەک شوێنی مەڵبەندی شارەکان ؟

① دەبێتە چەقی ڕێگای گواستنەوە لە زۆر لای جیاوازەوە .

② دەتوانرێت خۆی لەوەوە دوور بگرێت کە پارەی زیادە بچێتە ج کەرەستە سەرەتاییەکە ج شمەکە دروست کراوەکە .

هۆ/ بەندەرەکان لە زۆر کاتدا دەبنە مەڵبەندی گرنگ بۆ دامەزراندنی چەندین پیشەسازی ؟

چونکە پیشەسازی ئەو شوێنانە بۆخۆی هەڵدەبژێرێت کە هاتوچۆیان تێدا ئاسان وهەرزانە کە شوێنە دەریاییەکەی بەندەریش وادەکات کە هێنانی کەرەستەی سەرەتایی لە دەرەوە کەمی تێبچێت و پاشانیش بەئاسانی شمەکە دروست کراوەکە بنێردرێتە دەرەوە .

( زەوی و ئاو ) چ ڕۆڵێک دەبینن لە جێگیر بوونی پیشەسازی ؟

١- زەوی : هەموو پیشەسازیەک پێویستی بە رووبەرێکی زەوی ووشک و تەخت هەیە بۆ ئەوەی دامەزراوەکانی کارگەی لەسەر دامەزرێت ، پێویست بوونیش بۆ ئەو ڕووبەرە زەویە بە پێی جیاوازی پیشەسازیەکان و خاسیەتەکانیان دەگۆڕێت ، بۆنموونە پیشەسازی سووک پێویستی بە ڕووبەرێکی کەم هەیە وەک پیشەسازی سەعات یان جلوبەرگی ئامادەکراو یان هەویرەمەنی یان شیرینی ، کەچی پیشەسازی قورس پێویستی بە ڕووبەرێکی فراوان هەیە لەبەر ئەوە لە دەرەوەی شارەکان دادەمەزرێت چونکە ئەم پیشەسازیانە دووکەڵ و غازاتی بۆن ناخۆش و ئاوی پیس و دەنگە دەنگە گەورە بەجێ دەهێڵن وەک پیشەسازی ئاسن و پۆڵا، پترۆکیمیاوی،فرۆکە،کاغەز.

٢- ئاو : ئاو بە ڕەگەزێکی سەرەکی دادەنرێت لە گشت کردارەکانی پیشەسازی ومادەدەیەکی خاوی سەرەکیە لەگەڵێک پیشەسازیدا وەک پیشەسازی ساردەمەنی و ترشی،لەبەر ئەوە زۆربەی ئەم پیشەسازیانە لەنزیک رووبارەکان یان سەرچاوەی ئاوەوە دادەمەزرێن بۆ ئەوەی ئاوی پێویستیان بۆ مسۆگەر بێت،ئەو پیشەسازیانەی کە ئاوێکی زۆربەکاردەبەن وەک (أ) بەرهەم هێنانی یەک تۆن کاغەز لەکرۆکی دار پێویستی بە ( ٣٨٠٠٠ ) گالۆن ئاو هەیە. (ب) بەرهەم هێنانی یەک تۆن ئاسن وپۆڵا پێویستی بە ( ٦٥٠٠٠ ) گالۆن ئاو هەیە .(ج) بەرهەم هێنانی یەک تۆن ئاوریشمی دەستکرد پێویستی بە ( ٢٢٠٠٠٠ ) گالۆن ئاو هەیە .

کاری ( ڕۆڵی ) ئاووهەوا لە جێگیر بوونی پیشەسازیدا ڕوون بکەرەوە :

و/ لە ڕابردوودا ئاووهەوا کارێکی گەورەی دەکردە سەر هەڵبژاردنی شوێنی هەندێک پیشەسازی ؟

چونکە مرۆڤ هێشتا توانای ئەوەی نەبوو کە هەوای ناو کارگەکان وەک پێویست بگونجێنێت .

هۆ/ ناوچەی لەنکشایەر لە بەریتانیا لە هەموو ناوچەکانی تر بەناوبانگتر بوو بۆ پیشەسازی چنین ؟

چونکە پیشەسازی لۆکە چنین لە هەوای شێدار نەبووایە دانەدەمەزرا ئەمەش لە ناوچەی لەنکشایەر هەبوو .

ناوچەی لەنکشایەر : ناوچەیەکە لە بەریتانیا کە لە ڕابردوودا بە پیشەسازی چنین بەناوبانگ بوو بەهۆی هەوای شێداری ، پاشان ئەو ناوچەیە بوو پیشەسازی کارەبایی .

هۆ/ دامەزراندنی پیشەسازی پەیکەری فرۆکە لە باشووری خۆرئاوای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ؟

چونکە ئەم پیشەسازیە پێویستی بەوە هەیە کە خۆر بەدەرەوە بێت و ڕۆژیش سایەقە بێت ئەمەش یارمەتی پێکهێنانی چینێکی تەنکی ئۆکسیدی ئەلەمنیۆم دەدات کە ڕێگە نادات تووشی ژەنگ و داخوران بێت .

هۆ/ وەستانی چالاکی پیشەسازی ئاسن دەرهێنان لە باکووری سوید ؟ چونکە ناوچەکە دووچاری سەرما و سۆڵەی توند و سەخت دەبێ .

هۆ/ هەڵبژاردنی شوێنی پاڵاوگەی ( دۆرە ) لە بەشی باشووری خۆرهەڵاتی بەغدا ؟

چونکە شێوەی هەڵکردنی بای گشتی بەرەو باشووری خۆرهەڵاتە بەمەش دووکەڵ و بۆنی ناخۆش لەگەڵ خۆیدا ڕادەماڵێت .

**کاری ( رۆڵی ) چالاکی حکومەت لە جێگیر بوونی پیشەسازیدا روون بکەرەوە :**

دەوڵەت کە شوێنی دامەزراندنی پیشەسازیەکان هەڵدەبژێرێت چەند پاڵنەرێکی هەیە ، وەك :

١- دەیەوێ بێکاری لە ناوچەکەیدا نەهێڵێت کە دانیشتوانی چرە .

٢- هۆی سەربازی ستراتیژی ، وەك دوور خستنەوەی شوێنی کارگەکان لە سنووردوە ، هەروەك لە کاتی جەنگ لە ئەڵمانیا روویدا .

٣- بۆ پێشخستنی ناوچەیەکی تازە ، وەك لە ناوچەی ( سیبیریا ) کە روسیا هەوڵی بۆ دا .

٤- بۆ ئەوەی هەندێ ناوچەی پیشەسازی لەوە زیاتر پەرە نەسێنێت چونکە زۆربەی چالاکیەکانی تێدا کۆبۆتەوە ، بۆیە هەوڵ دەدات چالاکی پیشەسازی بەسەر ناوچە جیاوازەکانی وڵاتدا دابەش بکات .

٥- جاری واش هەیە شارەوانی ناوچەیەکی تایبەتی بۆ چالاکی پیشەسازی لەناو شارێکدا دیاری دەکات لەبەر چەند هۆیەکی وەك نەهێشتنی پیس بوون و دەنگە دەنگ و ژاوە ژاو .

**دیارترین ئەو گیروگرفتانەی کە دەبنە کۆسپ لە رێی پەرەسەندنی پیشەسازی لە دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان :**

١- **بنچینەی ژێرخان ( ژێر پەیکەر )** : بریتیە لە رێگای گواستنەوە و هاتوچۆ و دامەزراوی بەندەرەکان و فرۆکەخانە و دەزگاکانی پەروەردە و فێرکردن و تەندروستی ، و پرۆژەکانی ئاو و کارەبا و شوێنی نیشتەجێ بوون و مەڵبەندەکانی توێژینەوەی زانستی و دەزگاکانی تر کە خزمەت گوزاری پێشکەش بە کرداری بنیات نانی ئابووری دەکەن .

**روونی بکەرەوە:** ئایا بنچینەی ژێرخان بەکێشە دادەنرێت لەبەردەم پێشکەوتنی پیشەسازی لەوڵاتە تازەپێگەیشتوەکاندا؟

و/ لەم وڵاتانەدا دواکەوتویی ژێرخان نیشانەی جیاکەرەوەیانە و ئەم ژێرخانە ناتوانێت ئەرکی خۆی بەجێ بهێنێ لەخزمەتکردنی پەرەپێدانی ئابووری نیشتمانی،هەروەها یەکێکە لەو کۆسپ و تەگەرانەی کە دێتە پێش کرداری دوبارە بنیادنانەوەی ژێرخانی ئابووریان،بۆنمونە لەهیندستان کەژمارەی گوندەکانی لە (٥٠٠) هەزارگوند زیاترە تەنیا(١) گوند لە(٩) گوند رێگای هەیە و دەتوانرێ بەدرێژایی ساڵ بەکاربهێنرێ.لەهەندێ وڵاتانی ئەفریقیا وئەمریکای لاتینی دا کرداری ناردنی خواردەمەنی بۆ ئەوناوچانەی هەندێ ساڵ تووشی کارەسات دەبن کارێکی زۆر ئاڵۆزە یان پارەیەکی زۆرتری تێدەچێ ئەگەربێتو لەدەرەوە بهێنرێ بەهۆی تەنگوچەڵەمەی گواستنەوەی ناوخۆیی.

**هۆ/**ئە نجامدانی هەرپرۆژەیەك لەوڵاتەتازەپێگەیشتووەکان تێچوونی زیاترە لە هەرپرۆژەیەکی هاوشێوەی خۆی لەوڵاتە پێشکەوتوەکان؟ بەهۆی دواکەوتویی بنچینەی ژێرخان لە رێگاوبان وهێڵی ئاسنی پێویست بۆ پرۆژەکەودامەزراندنی شارێکی تەواو بۆکرێکاران...

٢- **شارەزایی هونەری** : دەستی کارگەر ( کرێکار ) لە پیشەسازیدا بریتیە لە :

أ - کرێکار بە کارامە و ناکارامەیانەوە .

ب- هونەریەکان ( تەکنیکاران ) و ئەندازیاران و دەرچوانی خوێندنگا زانستیەکان .

ج- بەرێوەبەرانی کارەکان یان پرۆژەکان .

**کرێکاری کارامە** : ئەو کرێکارەیە کە پیشەکەی پێویستی بە رۆشنبیریەکی سەرەتایی هەیە ، دوای ئەوەش مەشقی تایبەتی و پیشەگەری بۆ ماوەیەك پێ دەکرێت کە لە ساڵێکە کەمتر نەبێ جا ئەمە لە کارەکەیدا بێت یاخود لە پەیمانگاکەیدا .

**هونەریەکان ( الفنیون )** : ئەوکەسانەن کە قۆناغی خوێندنی ئامادەییان تەواو کردووە، جگە لە تەواوکردنی دوو ساڵی مەشقی هونەری .

**ئەم دەستەواژەیە روون بکەرەوە** : ( ئەو گیروگرفتەی کە وولاتە تازە پێگەیشتووەکان بەدەستیەوە دەناڵێنن ئەوەیە کە ژمارەی کرێکاری کارامەی پێویستی کەمە و بە گران دەست دەکەون ، بەڵام لە وڵاتە پیشەسازیەکان کرێکاری کارامە بە ئاسانی دەست دەکەون ) .

و/ لە وڵاتە پیشەسازیەکان مەشق پێکردنی کرێکاران شتێکی ئاسانە چونکە کرێکارەکان شارەزاییان هەیە لەبارەی سەرەتاکانی پیشەسازی و تەکنیك ، ئەمەش لە سروشتی پرۆگرامەکانی پەروەردە و فێرکردن هەڵقوڵاوە ، بەڵام لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان دەست کەوتنی کرێکاری کارامە و مەشق پێ کراو شتێکی گرانە ( زەحمەتە ) چونکە دانیشتوان شارەزاییان لە سەرەتا بنەرەتیەکانی تەکنیکدا کەمە ،بۆیە لەوڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا ، بەرهەمهێنان زۆری تێدەچێت هەرچەندە ئاستی کرێ نزم بێت.

٣- قەرزی بیانی :ئەم دەستەواژەیە ڕوون بکەرەوە : ( گرنگترین ئەوگیروگرفتانەی کە وولاتە تازە پێگەیشتووەکان بەدەستیەوە دەناڵێنن بریتیە لەگیروگرفتی پارەدان بە پرۆژەی پەرەپێدانی ئابووری بەشێوەیەکی گشتی وپەرەپێدانی پیشەسازی بەشێوەیەکی سەرەکی ) .

لەبەر لاوازی و کەمی پاشەکەوت کردن و کەمی سەرچاوەی دارایی لەو وڵاتانەدا ، جا لەبەر ئەوەی داهاتی تاکەکەس کەمە و ئاستی بژێویش نزمە بۆیە پاشەکەوت کردنیش لاواز دەبێت .

هۆ/ خاوەن سەرمایەکانی وڵاتە تازەپێگەیشتوەکان سەرمایەکانیان لەکەرتی پیشەسازی بەکارناهێنن؟

چونکە پرۆژەی پیشەسازی مەترسی تێدایە.

داگیرکاریی تازە:بریتیە لەوەی کە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان قەرزی بیانی وەردەگرن لە وڵاتە پێشکەوتووەکان ،کە زۆرجارئەو وڵاتانە دەست بەسەر ئابووری وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا دەگرن، چونکە ئەو قەرزانە بەچەند مەرجێکەوە بەستراون کە لە بەرژەوەندی وڵاتە قەرزدەرەکەدا دەبێت، وەک ئەوەی کە ئەوقەرزانە ئاراستەی کەرتی پیشەسازی ئاستراتیژی یاخود پیشەسازی بەکاربردن بکات کە سووی ئەم قەرزانەش زۆرن، هەر بۆیە ناوی داگیرکاریی تازەی لێ نراوە .

٤- پیس بوون : بریتیە لە فڕێدانی پاشماوە کە دەبێتە هۆی تێکدانی جوانی و پاکی ژینگە .بەڵام پیس بوون لە چەمکی زانستیدا بریتیە لە گۆڕان وناتەواوی سیستەمی ئایکۆلۆجی (ژینگەیی) لە پێکەوەژیانی نێوان زیندەوەران بە ڕووەک و گیانەوەرانەوە لە ژینگەیەکی دیاریکراودا، وەک ئەوەی زیندەوەرە وردەکان بفەوتێنێ کە ماسیەکان لە ژینگەی ئاویدا لەسەری دەژین ، یان ئەو پاشماوە و گەردیلانەی دەچنە هەواوە ناتەواوی لە پێکهێنەرەکانی هەوادا پەیدا دەکەن بۆنموونە ڕێژەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن زۆر دەکەن ، ئەمەش دەبێتە هۆی چەند نەخۆشیەکی دیاریکراو بۆ مرۆڤ و گیانەوەر و ڕووەک .هەروەها ژاوەژاو وە دەنگەدەنگیش کاردەکەنە سەر مێشکی مرۆڤ بەتایبەتی لە شارە چڕەکان و ناوچە پیشەسازیەکان.

هۆ / پیس بوون دیاردەیەکی سروشتیە لەکۆنەوە هەیە ؟

چونکە گڕکانەکان لەکاتی هەڵچوونیاندا غازاتی هەمەجۆر ودوکەڵ دەردەدەن یان گەردەلولی تەپوتۆزاوی بۆ هەندێ ژینگەی دراوسێی ناوچە بیابانەکان دەهێنن.

**گرنگترین ئەو ئامۆژگاریانەی کە دەبێ لە عێراق ڕەچاو بکرێن ئەگەر بویسترێت لە کارتێکردنی پیس بوونی پیشەسازی ڕزگار بین :**

١- دەست نیشان کردنی شوێنی پیشەسازی لەو ناوچانەی کە دوورن لە جێگیر بوونی دانیشتوانی شارەکان و بەدیکردنی هەڵبژاردنی شوێنی ئەوپیشەسازیانەی کە دووکەڵ دەردەدەن لەناوچەکانی باشووری خۆرهەڵاتی شارەکان دابمەزرێن ،بۆنموونە وەک بەغدا.

٢- ئاچارکردنی کارگە تازەکان و کۆنەکان بە دانانی پاڵێوگە بۆ پاککردنەوەی غازات یان کاربۆن یان ماددەی تر کە بەرەو ئاسمان بەرز دەبنەوە و ، کۆکردنەوەیان بۆ ئەوەی هەوا پیس نەکەن . ئەوەش سەبارەت بە هۆیەکانی گواستنەوە بە بەتایبەتی ئوتومبێل جێبەجێ دەکرێت .

٣- پێویستی دامەزراندنی دووکەڵکێشی بەرز کە لە (٥٠) مەتر کەمتر نەبێ و بگاتە (٧٥) مەتر بۆ پیشەسازی قورس ؟

بۆ ئەوەی دووکەڵەکە دووربکەوێتەوە و لە ناوچەکانی نزیک خۆیدا کۆنەبێتەوە .

٤- گواستنەوەی ئەو کارگانەی کە دەکەونە ناو شارەکان یاخود گەڕەك و شوێنە نیشتەنیەکانەوە بۆ ناوچەی تازەی دوورتر ، بۆنموونە شاری موصل چەند کارگەیەکی قیر و چیمەنتۆی تێدایە .

٥- پێویستە ناوچە پیشەسازیەکان بە پشتێنەیەکی سەوز وەك جیاکەرەوە دابڕیکرێن .

٦- پێویستە ئەو کارگانە کە گەردیلەی پیسکەر دەردەدەن ، دوور بخرێنەوە لە ناوچەکانی حەسانەوە و گەشت و گوزار ، وەك کارگەی چیمەنتۆی سلێمانی کە دەکەوێتە نزیك شوێنی سەرچناری گەشتیاری .

٧- ڕێکخستنی ژێرابی ئاوی پیس بۆ ناوچە پیشەسازیەکان و نەهێڵرێت بچنە ناو ئاوی ڕووبارەکانەوە ، وەك کارگەی شەکری موصل و کارگەکانی ڕۆنی ڕووەکی کە پاشماوەکانیان دەڕژێننە ناو ڕووبارەکان .

**-٥- گەورە بوونی شارەکان و جێگیر بوونی پیشەسازی تیایاندا : -**

**هۆ/دابەش بوونی دەزگا پیشەسازیەکان بەناڕێکی یەکێکە لەو گیروگرفتانەی کە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان بەدەستیەوە دەناڵێنن؟**

① گرنگترین پیشەسازیەکان و گەورەترین دەزگا پیشەسازیەکان لە شارێك یان دوو شاری وولاتدا جێگیر دەبێ ، لە کاتێکدا ناوچەکانی تر بێ بەش دەبن لە دەزگا پیشەسازیەکان . ② ئەمەش دەبێتە هۆی زیاد بوونی تێکڕای کۆچ کردن بەرەو ئەو شارانە کە هەلی کارکردنیان تێدا دەست دەکەوێ . ③ حکومەت ناتوانێت هەموو خزمەت گوزاریەکی شارەوانی و تەندروستی و فێرکردن دابین بکات . ④ ئەم ناوچانە دەبنە ژینگەیەکی نا تەندروستی و پیس لە لایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە ناوچەکانی تری وڵات بە دواکەوتوویی دەمێننەوە و خەڵکەکەی بە بێکاریەوە دەناڵێنن .

## پیشەسازی شەکر

**بۆشایی /** سەرجەمی بەرهەمهێنانی شەکری جیهان لە کاتی ئێستادا لە دوو سەرچاوەوە دێت **قامیشی شەکر** و **چەوەندەری شەکر** .

**هۆ/ شەکری چەوەندەر بە شێوەیەکی کەم نەبێت لە سەرجەمی بازرگانی دەوڵەتان بەشداری ناکات ؟**

و/ چونکە زۆربەی وڵاتە بەرهەم هێنەکان خۆیان ئەم جۆرە شەکرە بەکاردەبەن لە وڵاتەکانی خۆیاندا .

**هۆ/ ژمارەی وڵاتە شەکربەرهەم هێنەکان بەردەوام لەزۆربووندایە ،وبەرهەم هێنانی شەکری جیهانیش زۆر زیادی کردووە ؟**

و/ ① زۆربوونی داواکاری ( خواست ) لەسەر شەکر چونکە وای لێهاتووە بۆتە ماددەیەکی خۆراکی گرنگی مرۆڤ .

② بۆتە ماددەیەکی سەرەتایی بۆ چەندین پیشەسازی کە پشت بە شەکر دەبەستن .

**بۆشایی/**قامیشی شەکر لە بەروبومی هەرێمە خولگەییەکانە وباوەڕیش وایە کەنیشتمانە ڕەسەنەکەی **دۆڵی گەنج** بێت .

**قامیشی شەکر** تاکو سەرەتای سەدەی ١٩ تاکە سەرچاوەی شەکر بووە .بەڵام چەوەندەری شەکر بۆیەکەم دۆزرایەوە لە کیشوەری **ئەورووپا**.

| قامیشی شەکر | چەوەندەری شەکر |
|---|---|
| ١- لە بەروبوومی هەرێمە خولگەییەکانی جیهانە . | ١- لە بەروبوومی هەرێمە فێنکەکانی جیهانە . |
| ٢- بەروبوومێکی هەمیشەییە و یەکەم بەری لە ماوەی ٩-٢٢ مانگ دەدات . | ٢- ڕووەکێکی وەرزیە و پێویستە وەرزی گەشەسەندن بۆ ماوەی ٤-٦ مانگ بێ زوقم بێ . |
| ٣- پێویستی بە ١٥٠٠-٢٠٠٠ملم باران هەیە یان ئاوێك کە هاوتای ئەو بارانە بێت . | ٣- پێویستی بە ١١٠٠ملم باران هەیە لەساڵێکدا یان ئاوێك کە هاوتای ئەو بارانە بێت . |
| ٤- پێویستە پلەی گەرمی لە ٢٠ س کەمتر نەبێ چونکە ئەگەر پلەی گەرمی لە ١٨ س کەمتر بێ لە گەشەکردن دەوەستێ . | ٤- پێویستی بە ئاووهەوایەکی شێدار و هەتاو هەیە . |
| ٥- پێویستی بە خاکێکی بە پیتی دەوڵەمەند هەیە . | ٥- پێویستی بە خاکێکی لیتەیی سووکی تێکەڵ بە لم و دەوڵەمەند بە قسڵ هەیە . |
| ٦- شەکر لە لاسکەکەیەوە وەردەگیرێت . | ٦- شەکر لە ڕەگەکەیەوە وەردەگیرێت . |
| ٧- ئەو پارەیەی کە دەچێتە بەرهەم هێنانی کەمترە . | ٧- ئەو پارەیەی کە دەچێتە بەرهەم هێنانی زیاترە . |

**هۆ/ ئەو پارەیەی کەدەچێتەبەرهەم هێنانی شەکرلەقامیشی شەکر زۆرکەمترە لەوەی کەدەچێتە بەرهەم هێنانی شەکری چەوەندەر ؟**

① قامیشی شەکر بەروبوومێکی هەمیشەییە هەر سێ ساڵ جارێك دەڕوێنرێت ، بەڵام بەروبوومی چەوەندەر وەرزیە .

② بەرهەم هێنانی یەکەی ڕووبەر لەبەروبوومی قامیش دەگاتە (٤-٥) ئەوەندەی بەرهەم هێنانی هەمان ڕووبەر لەبەروبوومی چەوەندەر.

③ ئاستی کرێ لە هەرێمەکانی بەرهەم هێنانی قامیش زۆر نزمترە لە ئاستی کرێی هەرێمەکانی بەرهەم هێنانی چەوەندەر .

**بنەماکانی پیشەسازی شەکر :**

١- لە پێناوی دامەزراندنی پیشەسازی شەکر پێویستە یان قامیشی شەکر یان چەوەندەری شەکر بڕوێنرێت ( دابین بکرێت ) .

٢- بەرهەم هێنانی شەکر پێویستی بە سەرمایەیەکی زۆر هەیە کە لە دامەزراندنی کارگەی گوشین و پاڵاوتن خانوبەرە و گە نجینە و هۆی گواستنەوە و پێویستیەکانی تری ئەم پیشەسازیە بەکاردەهێنرێت .

٣- پیشەسازی شەکری سپی بەوە جیادەکرێتەوە کە پێویستی بە خێراییەکی زۆرە لە کارکردندا و پەیوەندیەکی بەتین لە نێوان کێڵگەکانی قامیش و چەوەندەر و کارگەکانی گوشیندا هەیە .

هۆ/ دەبێ هۆی گواستنەوەی قامیش و چەوەندەر لە کێڵگەوە بۆ کارگە خێرا و رێکوپێك بێت ؟

چونکە رووەکی شەکر ماددەیەکە زوو تێکدەچێت ، لەوانەشە ماددەی شەکرۆزی تێدا بگۆڕرێت بۆ ماددەیەکی ئەوتۆ کە ئەگەر ئاووهەوا گەرم و شێدار بێت لە دوای بڕینی بە رۆژێك ، ئەوا توانای بوونە کریستالی نەبێت .

٤- رووەکی چەوەندەر پێویستی بە کرێکاری زۆرتر هەیە لەوەی کە قامیشی شەکر پێویستی پێیەتی، بەلاَم نەبوونی کرێکاری هەرزان بۆ بەرهەمهێنانی شەکر لەکێڵگەکانی چەوەندەری شەکر لە ئەوروپاو ولاَتەیەکگرتوەکان بۆتە هۆی بەکارهێنانی ئامێرەمەکینە .

هۆ/ دەبێ کارگەکانی گوشینی شەکر لەناو کێڵگەکانەوە بێت یاخود لێوەی نزیك بێت ؟

چونکە شەکرە پوختەکە رێژەیەکی کەم پێکدێنێ لە کێشی ماددە سەرەتاییەکە کە دەگاتە ١٤-٢٠٪ .

هۆ/ زۆربەی ولاَتە شەکر هێنەکان سەبارەت بە دامەزراندنی پیشەسازی پالاَوتن وا بە باش دەزانن کە لەو بەندەرانەوە بێت کە شەکری خاویان بۆ دێت ؟

بە مەبەستی سووك کردنی هەندێ قورسایی لەسەر تەرازووی پارەدانیان و هاندانی دامەزراندنی پیشەسازی ناوخۆیی تیایاندا .

گرنگترین ولاَتە بەرهەم هێنەکانی شەکر :

١- هیندستان . ٢- بەرازیل . ٣- ولاَتە یەکگرتووەکان . ٤- چین . ٥- کوبا .

پیشەسازی پالاَوتنی نەوت : ئەم پیشەسازیە بە تەواوکەری گەڕان و پشکنین و پاککردنەوە دادەنرێت کە دەچنە بواری پیشەسازی دەرهێنان. پیشەسازی پالاَوتنی نەوت گرنگە چونکە لەو رێیەوە دەتوانرێت سوود لە نەوتە خاوەکە وەربگیرێت و مرۆڤ بەرووبومی نەوت (المشتقات النفطية ) ی لێ دەست دەکەوێت وەك بەنزینی ئۆتۆمبێل وڕۆنی دیزل ونەوتی سپی وڕۆن وگریس وماددەی تر.

پیشەسازی پالاَوتنی نەوت دوو قۆناغی دیوە ( بە دوو قۆناغدا تێپەڕیوە ) :

١- چەرخی کیرۆسین : کە لە سالَی ( ١٨٦٠ – ١٩٠٠ )ی خایاندووە لەم قۆناغەدا کیرۆسین ( نەوتی سپی ) لە برەودا بووە و خواستی زۆر بووە و کڕیاری زۆر بووە چونکە بۆ چرا و رووناك کردنەوە بەکاردەهات .

٢- چەرخی گازۆلین : لە سەرەتای سەدەی (٢٠ ) دەست پێدەکات بە دروست کردنی ئوتومبێل .لەم چەرخەدا بەرووبوومەکانی نەوت ژمارەیان زیادی کرد و بوارەکانی بەکاربردنیشیان فراوانتر بوو بەتایبەتی گازۆلین کە وەك سووتەمەنی ئۆتۆمبێل بەکارهێنرا .

هۆ/ پیشەسازی پالاَوتنی نەوت( لەچەرخی کیرۆسین ) دا بەستراوەوە بە بیرەکانی نەوتەوە تا سالَی ١٩١٣ ز ؟

چونکە رێژەی پاشماوە زۆر بەرز بووەوە و دەگەیشتە نزیکەی ٥٠٪ی کێشی نەوتی خاوی بەکارهێنراو ، جا بۆ دوور کەوتنەوە لە تێچوونی زۆر لە گواستنەوەی ئەو پاشماوانەی کە نرخیان نیە ، لە نزیك بیرەکانی نەوتەوە دادەمەزران .

هۆ/ کارگەکانی پالاَوتن( پالاَوگەکان ) لە جیهاندا لەیەك ناچن ؟

چونکە لەسەر بنەڕەتی ئەنجامەکانی تاقیگەیی جۆرەکانی نەوت ، نەخشەیان بۆ کێشراوە .

ئەو گازانەی کە لەگەلَ نەوتدا دەردێن دوو جۆرن :

١- گازە نەتواوەکان : کە ئەمانەش لە نەوتەکە جیادەکرێنەوە بەهۆی ئەو جیاکەرەوانەی کە لە وێستگەکانی جیاکردنەوەی گاز هەن لە نزیك بیرە نەوتەکان .

٢- گازە تواوەکان : کە ئەمانەش لە نەوتەکە جیا دەکرێنەوە بەهۆی کرداری خەست کردنەوە کە بریتیە لە دلَۆپاندنی نەوت بۆ ئەوەی زۆرترین ئەندازەی گازە تواوەکانی ناو نەوتەکەی لێ جیابکرێتەوە بۆ ئەوەی لە پاشاندا بە ئاسانی و بە سەلامەتی بگوێزرێتەوە لە ژێر پەستانی سروشتیدا .

دلَۆپاندنی هەوایی (کەرتی): بریتیەلەکرداری دەزگای پالاَوتنی نەوت کە لەکوورەیەکی گەرم کردنی نەوتی خاو ولە قوللە (برج ) ێك پێکهاتووە بۆ بەجێ هێنانی کرداری جیاکردنەوەی دلَۆپاوەکان لە رۆنی نیشتەنی سووتەمەنی ( نەوتی رەش ) . کە رۆنی نیشتەنی سووتەمەنیەکەش دەنیشێتە خوار قوللەکەوە لەوێوەش رادەکێشرێت بۆ ناو کۆگاکان دوای ساردکردنەوەی .

**خاسیەتەکانی پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت :**

١- پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت بە یەکێ لەو پیشەسازیانە دادەنرێت کە ڕێژەی کێشی وون بووی زۆر کەم تێدایە .

٢- پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت لەوپیشەسازیانەیە کە قەبارەی کەرەستە سەرەتاییە بەکارهێنراوەکە زۆرتر دەکەن، بۆنمونە پاڵاوتنی (١٠٠٠) بەرمیل لە نەوتی خاو زیاتر لە (١٠٠٠) بەرمیل لە کیرۆسین وگازۆلین و ڕۆن وبەنزین ودەرهێنراوەکانی تر بەرهەم دەهێنێت.

٣- بەروبووم و لێ دەرهێنراوەکانی نەوت گەلێ زۆرن .

٤- لە پاڵاوگە تازەکاندا ، تەکنیک لە ئاستێکی زۆر بەرزدایە ، لەبەر ئەوە دەستی کارگەری زۆر ناوێت کە ئەمەش وا دەکات ئەم پاڵێوگانە بە هەرزانی بکەونە گەڕ .

٥- پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت پێویستی بە سەرمایەیەکی زۆر گەورە هەیە ؛ بەهۆی بەرزیی نرخی ئامێر و مەکینەکانی یەکەکانی بەرهەم هێنانیەوە .

**شوێنی کارگەکانی پاڵاوتنی نەوت ( پاڵێوگەکان ) هەڵدەبژێردرێت بە پێی ئەم بنچینانەی خوارەوە :**

١- بوونی ڕووبەرێکی فراوانی زەوی بە مەبەستی فراوانی بوونی داهاتوو، ئەوەش لەبەرچاو بگیرێ کە ئەشێت ڕووبدات لە کرداری پاڵاوتندا .

٢- بوونی سەرچاوەی ئاوی هەمیشەیی بە مەبەستی ساردکردنەوە و پاك کردنەوە چونکە پاڵاوتنی یەك بەرمیل نەوتی خاو پێویستی بە نزیکەی ٧٠ گالۆن ئاو( دووبەرمیل ئاو ) هەیە .

٣- لەبەر ئەوەی ئەو پیشەسازیە دووکەڵ و هەڵم و غازات دەردەدات ، بۆیە لە کاتی هەڵبژاردنی شوێنەکەی دەبێ ئاراستەی ( با ) لەبەرچاو بگیرێ، بۆنموونە پاڵێوگەی دۆرە لە باشووری خۆرهەڵاتی بەغدا دامەزراوە چونکە ئەو بایەی کە هەڵدەکات باکووری ڕۆژئاوایە.

٤- زۆربەی ئەو پاشەڕۆیانەی کە ئەم پاڵێوگانە دەری دەدەن ژەهراویە ، بۆیە پێویستە کە ئاوی پاشەڕۆکان پاك بکرێتەوە لە ژەهر پێش ئەوەی بڕژێتە ناو ڕووبار و دەریاچەکان .

٥- بە زۆری شوێنی پاڵێوگەکان هەڵدەبژێردرێ لەسەر ڕێگا ئاویەکان لە بەندەرەکاندا ؟

① بۆ هێنانی نەوتی خاو لە دەرەوە. ② بۆ ئەوەی گواستنەوەی دەرهێنراوەکانی نەوت ئاسان بێت .

**پاڵێوگەکان بە زۆری دابەش دەبن بەسەر سێ جۆردا :**

١- ئەو پاڵێوگانەی دەکەونە نزیك چاڵە نەوتیەکان .

٢- ئەو پاڵێوگانەی دەکەونە نزیك بازاڕەکان .

٣- ئەو پاڵێوگانەی دەکەونە شوێنێکی ناوەند لە نێوان چاڵە نەوتیەکان و بازاڕەکان .

**هۆیەکانی گۆڕانی شوێنی پاڵێوگەکان لە نزیك چاڵە نەوتیەکان بۆ نزیك بازاڕەکان دەگەڕێتەوە بۆ :**

١- وڵاتە داگیرکەرەکان کە خاوەنی گەورەترین کۆمپانیاکانی قۆرخ کردنی دەرهێنان و گواستنەوەی نەوت بوون ، دەترسان لە خۆماڵی کردنی دەستگاکانیان لەلایەن حکوماتە نیشتمانیە سەربەخۆکانەوە چونکە : ① جولانەوەی ڕزگاریخوازی وخۆماڵی کردن پەرەی سەند بەتایبەتی پاش خۆماڵی کردنەکەی ( مصدق ) لە ئێران ساڵی ١٩٥٢ و، خۆماڵی کردنی نۆکەندی سوێس ساڵی ١٩٥٦.

② گواستنەوەی نەوتی خاو زۆر کەمتری تێدەچێت لە گواستنەوەی بەروبوومە زۆرەکانی .

٢- بۆ ئەوەی کۆمپانیا قۆرخ کارەکان زۆرترین قازانج بەدەست بێنن دوای پاڵاوتنی نەوتەکە، و وڵاتە بەرهەم هێنەکان ( کە بە زۆری وڵاتانی تازە پێگەیشتوون ) بێ بەش بکەن لەو قازا نجانە، وهیچیان بۆ نەهێڵنەوە تەنها ئەو بەشەکەمەنەبێت لەفرۆشتنی نەوتی خاودا.

٣- دڵنیا بوون لە بوونی گە نجینەیەکی ستراتیژی نەوت .

٤- زۆر کردنی ( فەراهەم کردنی ) کەرەستەی سەرەتایی بۆ پیشەسازیە پترۆکیمیاویەکان .

## دابەش بوونی جوگرافی پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت :

١- **وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا** : کە لە کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی و ، کەنارەکانی کەنداوی مەکسیك و ، لە کالیفۆرنیا و ، ناوچەکانی ناوەوە نزیك شیکاگۆ کۆبوونەتەوە .

٢- **ژاپۆن** : گەورەترین پاڵێوگەکانی ئاسیا لە بەندەرەکانی ژاپۆن و سەنگافورە کۆبوونەتەوە .

٣- **ناوچەی دەریای کاریبی** : لە ناوچە سەرەکیەکانی پاڵاوتنن و لە دوو دوورگەدا کۆبوونەتەوە کە ئەوانیش: ئەروبا و کراساو .

**هۆ/ هەڵبژاردنی کۆمپانیای ( شل )ی هۆڵەندی هەردوو دوورگەی ئەروبا وکراساو لەناوچەی دەریای کاریبی بۆناوچەی پاڵاوتنی نەوت؟**

١- بۆ ئەوەی دووریان بخاتەوە لە جووڵانەوەکانی ڕزگاریخوازی وخۆماڵی کردن لە وڵاتانی ئەمەریکای لاتینی بە تایبەتی ڤەنزوێلا.

٢- لەبەر قووڵی ئاو نزیك کەنارەکانیان .

٤- لە ئەمەریکای باشووردا پاڵێوگەکان لە دوو دەوڵەتدا کۆبوونەتەوە کە کەنارەکانی ڤەنزوێلا و بەرازیلە .

٥- لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا پاڵێوگەکانی نەوت جێگیردەبن لەکەنارەکاندا چونکە ئەوروپا گەورەترین بەکاربەری نەوتە .

## گرنگترین پاڵێوگەکانی عێراق :

① پاڵێوگەری صلاح الدین ( بێجی ) .

② پاڵێوگەی دۆرە لە باشووری بەغدا .

③ پاڵێوگەی حەدیسە لە ئەنبار کەلەساڵی ١٩٣٨ تەواو بووەو نەوتی خاوی لەکانەکانی کەرکوك بۆ دێت .

④ پاڵێوگەی باباگوڕگوڕ لە کەرکوك( کەساڵی ١٩٧٢ دامەزرا . ⑤ پاڵێوگەی بەصرە لە شوعەیبە .

⑥ پاڵێوگەی سەماوە( کە نەوتی خاوی لە لولەی هێڵی ستراتیژی بۆدێت . ⑦ پاڵێوگەی موصل.

⑧ پاڵێوگەی قیر لە قەیارە خوار موصل. ⑨ پاڵێوگەی کەسك لە موصل. ⑩ پاڵێوگەی الحبانیة لە ئەنبار.

**پاڵێوگەی دۆرە** :دەکەوێتە باشوری خۆرهەڵاتی بەغداد، ساڵی ١٩٥٥ تەواوبووە، ووزەی بەرهەمداریەکەی گەیشتە ٤ملیۆن تەن، نەوتی لە چاڵە نەوتەکانی کەرکوك بە بۆری بۆ دەگوازرێتەوە، کۆکارگەیەکی پیشەسازیە بۆ بەرهەمهێنانی بەنزین و ڕۆن ولولەی غازی شل و دەرمانی مێرووکوژ وگریس ومۆم ونەسفەلت.

**پاڵێوگەی کەسك** :دەکەوێتە خۆرئاوای شاری موسڵ، ساڵی ١٩٨٢ تەواوبووە، پێداویستی بەروبومی نەوت دابین دەکات بۆ باکوری خورئاوای عێراق وهەرێمی کوردستان، تواناى ساڵانەی نیو ملیۆن تەن بوو، نەوتی لەچاڵەنەوتەکانی کەرکوك بە بۆری بۆ دەگوازرێتەوە.

**پیشەسازیە پترۆکیمیاویەکان** : هەموو ئەو پیشەسازیانە دەگرێتەوە کە پشت دەبەستن بە دەرهێنراوە نەوتیەکان و گازی سروشتی بەو سیفەتەی کەرستەی سەرەتایی سەرەکین لە کردارەکانی بەرهەم هێناندا .

**هۆ/ پیشەسازیە پترۆکیمیاویەکان لە پیشەسازیە ستراتیژیەکانن ؟**

چونکە زۆربەی بەرهەم هێنراوەکانی لە کەرەسە ناوەندیەکانە کە کەڵکی لێ وەردەگیرێت بۆ پیشەسازیەکانی تر .

**گرنگترین ئەو پیشەسازیانەی کە پشت دەبەستن بە دەرهێنراوە نەوتیەکان و گازی سروشتی بریتین لە :**

١- پیشەسازی مادده پلاستیکیەکان .

٢- پیشەسازی لاستیکی دەستکرد .

٣- پیشەسازی ڕیشاڵی دەستکرد .

٤- پیشەسازی پەیینی کیمیاوی .

٥- پیشەسازی پوختەکردنی گۆگرد .

٦- پیشەسازی پاکژ کەرەوەکان .

٧- پیشەسازی بۆیاغ و ڕۆن .

٨- پیشەسازی داوودەرمان .

٩- پیشەسازی ڕستن و چنین ، و نایلۆن و داکرۆن و ترگال و تەرلین .

١٠- پیشەسازی ئۆتۆمبێل، چونکە دەچێتە ناو زۆربەی ئامرازەکانی ئۆتۆمبێل تەنانەت هەیکەلەکانی کە لە پلاستیک دروست دەکرێن .

١١- پیشەسازی پرۆتین، چونکە ئەم ماددەخۆراکیانە لە دەرهێنراوە نەوتیەکان دروست دەکرێت و ، وەك ئالیکی ئاژەڵیش دێنە بەرهەم .

**پیشەسازیە پترۆکیمیاویەکان پشت دەبەستن بەم کەرەستە سەرەتاییانەی خوارەوە :**

① گازی پاڵاوگەکان . ② گازی سروشتی کە باشترین کەرەستەی سەرەتاییە بۆ بەرهەم هێنانی ئەسیلین .

③ دڵۆپێنراوە نەوتیە شلەکان . ④ نەوت و دڵۆپێنراوە قورسەکان .

**خاسیەتەکانی پیشەسازیە پترۆکیمیاویەکان :**

١- گەورەیی قەبارەی سەرمایە بەکارخراوەکان : ئەم پیشەسازیە پێویستی بە سەرمایەیەکی گەورە هەیە ؟

چونکە لەسەر شێوەی کۆکارگە ( مجمع )ی تەواوکەری یەکترن و ، ووزەی بەرهەم داریان زۆرە .

٢- ئەم پیشەسازیە تازەترین ئامراز و هۆیەکانی بەرهەم هێنانی تێدا بەکاردەهێنرێت ، بۆیە ژمارەیەکی کەمی دەستی کارگەر (کرێکار)ی دەوێ بەڵام لە ئاستێکی زۆر بەرزدا بن .

٣- ئەم پیشەسازیە بە پەرەسەندنی دینامیکی خێرا ناسراون ؟

چونکە لە هەر ساڵێکدا دروست کراوی پترۆکیمیاوی تازە دەردەکەوێت کە زۆر باشترە لە دروست کراوەکانی بازاڕ .

٤- ئەم پیشەسازیە لەسەر بنەڕەتی بەرهەم هێنانی گەورە دادەمەزرێن ،لەبەر ئەوە پێویستی بە بازاڕی فراوانە بۆ فرۆشتن .

٥- بەرزی تێچوونی پاراستن لەم پیشەسازیانە ؟ چونکە ئامێر و مەکینە بەکارهێنراوەکانی زوو لەناو دەچن .

٦- ئەم پیشەسازیە خۆڵەمێش و دووکەڵ و غازات و بۆنی ناخۆش دەردەدەن کە دەبێتە هۆی پیس بوونی ژینگە .

**دابەش بوونی جوگرافی پیشەسازیە پترۆکیمیاوییەکان**

ووڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا و روسیای فیدراڵ و ژاپۆن و ئەڵمانیا وفەرەنسا و ئیتالیا و بەریتانیا.

هۆ / شوێنی نمونەیی بۆ پەیدابوونی پیشەسازیە پترۆکیمیاویەکان بریتیە لە ولاتە بەرهەمهێنەکانی نەوت ؟

چونکە پێویستیان بۆ بەرهەمهێنراوەکانی ئەم پیشەسازیە لە زۆربوونی بەردەوام دایە .

# هەڵبژاردنەکانی بەشی شەشەم/ پیشەسازی

١. لەگیروگرفتی پیشەسازی لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان :
(کانزاکاری –بۆبازاڕئامادەکردن –خوونەریتی کۆمەڵایەتی –پیس بوون).

٢. گەورەترین پاڵێوگەکانی نەوت لە ئاسیا دەکەونە بەندەرەکانی :
(چین – مالیزیا – سەنگافورە – تایلەند).

٣. لە پیشەسازیە ئاراستەکراوەکان بەرەو کەرەستە سەرەتاییەکان وەک پیشەسازی :
(سەعات – چنین – شەکر – کەشتی).

٤. لەو پیشەسازیانەی کەبەرهەمەکانیان زوو لەناو دەچن پاش دروستکردنیان وەک پیشەسازی :
(جلوبەرگ – پلاستیک – بەروبومی شیرەمەنی – یاری منداڵان).

٥. لەگرنگترین وڵاتە بەرهەمهێنەکانی شەکر لە جیهاندا : (کوبا – ئەڵمانیا – میسر – نیکوادۆر).

٦. چەرخی کیرۆسین کەلەساڵی ١٨٦٠ دەستی پێکرد و تاساڵی ١٩٠٠ ی خایاند ناسراوە بە چەرخی :
(بەنزینی ئۆتۆمبیل – نەوتی سپی – گازوایل – نەوتی ڕەش).

٧. قامیشی شەکر لە بەروبومی هەرێمە خولگەییەکانە وباوەڕیش وایە کەنیشتمانە ڕەسەنەکەی دۆڵی :
(نیل –یانگستی –رافیدەین –گەنج) بێت.

٨. گشت ئەو کردارانەیە کە لەگەڵ کەرەستە خاوەکاندا دەکرێت وەک قۆناغێکی ئامادەکردن پێش گۆڕینی بۆ کەلوپەلی دروست کراو :
(پیشەسازی گۆڕانکاری –پیشەسازی ئامادەکردن – پیشەسازی دەرهێنان – پیشەسازی بەکاربردن).

٩. لەکیشوەری ئەمریکای باشور پاڵێوگەکانی نەوت کۆبونەتەوە لەکەنارەکانی :
(کۆلۆمبیا – پیرۆ – ئەرجەنتین – بەرازیل).

١٠. ئەوکەسانەی کە قۆناغی خوێندنی ئامادەییان تەواوکردووە جگە لەتەواوکردنی دووساڵی مەشقی هونەری ناسراون بە :
(هونەریەکان – کرێکاری کارامە – بەڕێوەبەرانی کارگەکان – کرێکاری ناکارامە).

١١. پاڵێوگەی دۆرە کەلە ساڵی ١٩٥٥ تەواو بوو دەکەوێتە پارێزگای : (میسان – بەغداد –ناسریە – بەسرە).

١٢. هەر کەرەستەیەک کە لە کاتی سووتاندنیدا ئاگری لێ پەیدا ببێت پێی دەوترێت:
(ووزە – سوتەمەنی – زەرە – ڕەگەز).

١٣. لەو پیشەسازیانەی کەدابەش دەکرێن لەسەربنەڕەتی سروشتی بەرهەمداری وەک پیشەسازی :
(دەرهێنان– بنەڕەتی– قورس–سووک).

١٤. ئەو پیشەسازیانەی لە کێش و قەبارەی ئەو کەرەستە سەرەتاییانەی تێیدا بەکارهێنراون زیاد دەکات ، وەک :
(پلاستیک – ئارایشت – ڕستن وچنین –ساردەمەنی).

١٥. سامانێکە بەدەست هاتووە لە ئەنجامی کارێکی لەوەو پێش،وبەکاریش دێ بۆ بەرهەم هێنانی سامانێکی تر :
(بازاڕ –گواستنەوە – سەرمایە – ئامێری بەرهەمهێنان).

١٦. باشترین کەرەستەی سەرەتاییە بۆ دروست کردنی ئەسیلین : (نەوت - خەڵووز – گازی سروشتی – گۆگرد).

١٧. پیشەسازی لەسەر بنەڕەتی چۆنێتی بەرهەمە پیشەسازیەکە ، وەک :
(پیشەسازی سووک –پیشەسازی بەکاربردن – پیشەسازی دەرهێنان – پیشەسازی ئامادەکردن).

١٨. لەکەرەستە خاوە زوو لەناوچووەکان وەک پیشەسازی : (چیمەنتۆ –لۆکە –پاڵاوتنی نەوت –سپیایی).

١٩. لەو پیشەسازیانەی کەبایەخ بەوە دەدەن ژمارەیەکی زۆری کرێکاریان هەبێت وەک پیشەسازی :
(سەعات –پاڵاوتنی نەوت – ئۆتۆمبیل – شەکر).

٢٠. ناوچەی لەنکشایەرلەبەریتانیا لەرابردوودا لەهەموو ناوچەکانی تر بەناوبانگتربوو بۆ پیشەسازی:
(شەکر–چنین–ئۆتۆمبیل–سەعات).

٢١. لەو پیشەسازیانەیە کە دەبێت هۆی گواستنەوەکەی خێراو ڕێکوپێک بێت: (چنین–شەکر–جگەرە–مۆبیلیات).

٢٢. تائێستا پەیوەندی لەنێوان جۆری ئاووهەوا ودامەزراندنی هەندێک پیشەسازی هەر هەیە وەك پیشەسازی پەیکەری:
(ئۆتۆمبێل–کەشتی–شەمەندەفەر–فڕۆکە).

٢٣. هەڵبژاردنی شوێنی پاڵێوگەی دۆرە لەباشوری بەغد دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری:
(دەستی کار–بایەکان–کەرەستەی خاو–گواستنەوە).

٢٤. لەگیروگرفتەکانی پیشەسازی لە وڵاتە تازەپێگەیشتوەکان:
(نەبوونی بازاڕ–کەمی کەرەستەی خاو–دواکەوتویی بنچینەی ژێرخان–کەمی سەرچاوەکانی ووزە).

٢٥. پیشەسازی ئاراستەکراو بەرەو سوتەمەنی و سەرچاوەکانی وزە وەك پیشەسازی:
(ئەلەمنیۆم–سەعات–چیمەنتۆ–شەکر).

٢٦. ئەو پیشەسازیانەیە کەشێوەی خاوەکان دەگۆڕێت لەبارە ڕەسەنەکەیەوە بۆ بۆ بارێکی نوێ کە پێداویستی مرۆڤ پڕ بکاتەوە:
(گۆڕانکاری –دەرهێنان –بەکاربردن –ئامادەکردن).

٢٧. لەنمونەی پیشەسازی بەکاربردن: (پاڵاوتنی نەوت–کەلوپەلی ناوماڵ–ئاسن وپۆلا–بەدەستهێنانی وزەی کارەبا).

٢٨. ئەو پیشەسازیانەی کە پێویستیان بە ئەندازەیەکی کەمی کەرەستەی سەرەتایی هەیە کەمەرج نیە لەبازاڕەوە نزیك بێت. وەك:
(A- پیشەسازی پلاستیك B- پیشەسازی کەلوپەلی کارەبایی
C- پیشەسازی کەلوپەلی ناوماڵ D– هەریەکە لە A وB ڕاستە).

٢٩. پیشەسازی لەسەر بنەڕەتی قەبارەی سەرمایە وجۆری بەرهەمهێنان وەك پیشەسازی:
(قورس–بنەڕەتی–بەکاربردن–دەرهێنان).

٣٠. لە پیشەسازیە ئاراستەکراوەکان بەرەو بازاڕ وەك پیشەسازی:
(قوتوو –جلو بەرگی ئامادەکراو–سەعات–کەشتی).

٣١. لە پیشەسازیە ئاراستەکراوەکان بەرەو دەستی کارگەران وەك پیشەسازی: (کەشتی –چنین –مۆبیلیات– شەکر).

٣٢. لە پیشەسازیە ئاراستەکراوەکان بەرەو ڕێگاکانی گواستنەوەو هاتوچۆ وەك پیشەسازی:
(کەشتی –ئەلەمنیۆم–شەکر–سەعات).

٣٣. لەکەرەستە خاوەکانی بە کێش قورس وبە قەبارە گەورەن بەڵام پاش پیشەسازی قەبارەوکێشیان زۆر کەم دەکات وەك پیشەسازی:
(پاڵاوتنی نەوت–خەست کردنی مس–سپیایی–خوری).

٣٤. ئەو پیشەسازیانەی کەلەجێگیربوونیدا دابەشبونی کارگەران کاری تێناکات چونکە لەوانەیەبەئامێرومەکینە بکرێت وەك پیشەسازی:
(پاڵاوتنی نەوت –ئامێری ئەلکترۆنی– ئۆتۆمبێل–شەکر).

٣٥. ئەو پیشەسازیانەی کەدەست ڕەنگینی وشارەزایی و پسپۆریەکی ووردیان دەوێت وەك پیشەسازی:
(چنین–ئامێری مۆسیقا–پاڵاوتنی نەوت –شەکر).

٣٦. ناوچەی دەریای کاریبی لەناوچە سەرەکیەکانی پاڵاوتنی نەوتن ولەدوو دوو دوورگەدا کۆبونەتەوە لەوانە:
(کاسا –کراساو –نیوفاوندلاند –هۆنشۆ).

٣٧. لە ئەمریکای باشوردا پاڵێوگەکان زیاتر لە دوو دەوڵەت دا کۆبونەتەوە لەوانە:
(کۆلۆمبیا– شیلی – ئەرجەنتین– فەنزوێلا).

٣٨. پاڵێوگەی کەسك بۆ پاڵاوتنی نەوت دەکەوێتە پارێزگای: (ئەنبار –صلاح الدین – موسڵ – کەرکوك).

٣٩. لە بەروبومی هەرێمە فێنکەکانی جیهانە: (چەوەندەری شەکر –قامیشی شەکر –کاکاو – لاستیك).

٤٠. لە بەروبومی هەرێمە خولگەییەکانی جیهانە : ( قامیشی شەکر –چەوەندەری شەکر-لۆکە –توتن ).

٤١. پیشەسازی خستنەناوقوتو( قوتوسازی ) بەزۆری دادەنرێت لەنزیک :

( بازاڕەکان – ڕێگاوبان – دانیشتوان – کەرەستەی سەرەتایی ).

٤٢. لە پیشەسازیە بنەڕەتیەکان دادەنرێت :

( A- پاڵاوتنی نەوت B-کەلوپەلی ناوماڵ C- دروستکردنی پێڵاو D-هەریەکەلە BوA ).

٤٣. هەڵبژاردنی پاڵێوگەی دۆرە لە بەشی باشوری خۆرهەلاتی بەغدا دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری :

( سەرمایە – گواستنەوە – ئاووهەوا – زەوی وئاو ).

٤٤. دەبێتە هۆی زۆربوونی تێکڕای کۆچکردن بۆ ئەو شارانەی کە هەلی کارکردنیان زۆرە :

( کشتوکاڵ – کانزاکاری – بازرگانی – پیشەسازی ).

٤٥. شەکری چەوەندەر بەشێوەیەکی کەم نەبێت لەسەرجەمی بازرگانی دەوڵەتاندا بەشداری ناکات، چونکە :

( خۆیان بەرهەمەکە بەکاردەبەن – شەکرەکە خراپە – ناوچەکانی بەرهەمهێنان دوورن لەبازاڕەوە – زۆری تێ دەچێت ).

٤٦. پاڵاوگەی باباگوڕگوڕ لەشاری کەرکوک دامەزرا لەساڵی : ( ١٩٧٠ – ١٩٧١ – ١٩٧٢ – ١٩٧٣ ).

٤٧. پیشەسازی لەسەر بنەڕەتی قەبارەی سەرمایە وجۆری بەرهەمهێنان دابەش دەکرێت بۆ پیشەسازی :

( قورس وسوک – بنەڕەتی وبەکاربردن – دەرهێنان وئامادەکردن و گۆرانکاری – گشتی وتایبەتی وتێکەڵ وبیانی ).

٤٨. ئەو پیشەسازیانەی لەکێش و قەبارەی ئەو کەرەستە سەرەتاییانەی بەکارهێنراون تیایدا زیاد دەکات ، دەکەوێتە نزیک :

( کەرەستە سەرەتاییەکان – سەرمایە – بازاڕ – هیچ کامیان ڕاست نین ).

٤٩. پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت پێویستیەکی زۆری نییە بە :

( ئامێرومەکینە – ڕوبەرێکی فراوانی زەوی – سەرچاوەی ئاوی هەمیشەیی – ژمارەی کرێکار ).

٥٠. بەندەرەکان لە زۆر کاتدا دەبنە مەڵبەندی ئەو جۆرە پیشەسازیانەی کە پشت دەبەستن بە :

( سەرمایەی زۆر – دەستی کارکەری شارەزا – ماددەی سەرەتایی لەدەرەوە هاتوو – ماددەی سەرەتایی ناوخۆ ).

٥١. لەو گیروگرفتانەی کە دەبنە کۆسپ لە ڕێی پەرەسەندنی پیشەسازی لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان :

( دواکەوتوویی بنچینەی ژێرخان –کەمی کرێکاری کارامە – پیسبوون – هەرهەموویان ڕاستن ).

٥٢. پاڵاوگەی حەدیسە دەکەوێتە پارێزگای : ( کەرکوک – ئەنبار – موسڵ – صلاح الدین ).

٥٣. یەکێك لە خاسیەتەکانی پیشەسازیە پترۆکیمیاویەکان ئەوەیە کە :

( A- دەبێتە هۆی پیس بوونی ژینگە B- پێویستی بەسەرمایەی گەورە نییە

C- پێویستی بە بازاڕی فراوانە بۆ فرۆشتنی بەرهەمەکانی D- هەریەکە لە CوA ڕاستە ).

٥٤. پێشکەوتن لە بەرهەمهێنانی شەکر لە جیهاندا دەگەڕێتەوە بۆ :

( داواکاری زۆر – بەرهەمهێنانی زۆر – تێچوونی بەرهەمهێنانی کەم – هیچ کامیان ڕاست نین ).

٥٥. پیشەسازی پێستەخۆشکردن و هاڕینی دانەوێڵە بەیەکێك لەم پیشەسازیانە دادەنرێت :

( بنەڕەتی – دەرهێنان – گۆڕانکاری – ئامادەکردن ).

٥٦. هۆی بەکارهێنانی ئامێرومەکینە بۆ بەرهەمهێنانی شەکر لە کێڵگەکانی چەوەندەری شەکر دەگەڕێتەوە بۆ :

( پێویست نەبوون بە کرێکاری زۆر – نەبوونی کرێکاری شارەزا – تەختانی زەوی – نەبوونی کرێکاری هەرزان ).

٥٧. خاوەن سەرمایەکانی وڵاتە تازەپێگەیشتوەکان سەرمایەکانیان لەکەرتی پیشەسازی بەکارناهێنن، چونکە :

( دەبێتە هۆی پیس بوونی ژینگە – سەرمایەی زۆری پێویستە –

دەستی کارگەر لەم وڵاتانەدا کەمە – پرۆژەی پیشەسازی مەترسی تێدایە ).

٥٨. پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت لە چەرخی کیرۆسین بەسترابوەوە بە :
(بەندەرەکان – بازاڕەکان – هێڵی ئاسن – بیرە نەوتەکان).

٥٩. پیشەسازییەکان بۆ چەشنی بنەرەتی وبەکاربردن دابەش دەکرێت لەسەر بنەرەتی :
(سەرچاوەی کەرەستەی خاو – هۆکارەکانی جێگیربوون – موڵکایەتی – چۆنیتی بەرهەمە پیشەسازیەکە).

٦٠. ئەنجامدانی هەرپرۆژەیەك لەوڵاتەتازەپێگەیشتووەکان تێچوونی زیاترە لە هەرپرۆژەیەکی هاوشێوەی خۆی لەوڵاتە پێشکەوتوەکان، بەهۆی : (کەمی کرێکار – دواکەوتویی بنچینەی ژێرخان – ئاووهەوای نەگونجاو – سەرمایەی زۆر).

٦١. سەرمایەی بەرهەمهێنراو لە ئەنجامی کارلێك کردنی ئەمانە دێتە کایەوە :
(بازاڕ و کار – کار و سەرمایەی نەختینە – سەرمایەی نەختینە و بازاڕ – بازرگانی و بازاڕ).

٦٢. ئەم پیشەسازیە بە پلەی یەکەم بایەخ دەدات بە جۆری کار : (چنین – سەعات – جگەرە – پاڵاوتنی نەوت).

٦٣. ئەم پاڵێوگەیە نەوتی خاوی بۆدێت لە لولەی هێڵی ستراتیژیەوە : (بەسرە – موسڵ – سەماوە – کەسك).

٦٤. مەرج نییە ئەم پیشەسازییە لەم دەوڵەتانە بێت کە خاوەکە بەرهەم دەهێنێت :
(A- قوتوسازی(لەقوتونان) B- چیمەنتۆ C- لۆکەوخوری D- هەموو وەڵامەکان راستن).

٦٥. پیشەسازی پترۆکیمیاوی پێویستی زۆری نییە بە : سەرمایەی زۆر – بازاڕی فراوان – ئامێر و مەکینە – دەستی کارکەری زۆر).

٦٦. چەوەندەری شەکر بۆ یەکەم جار دۆزرایەوە لە کیشوەری : (ئاسیا – ئەمریکای باشور – ئەوروپا – ئوسترالیا).

٦٧. بەهۆی بوونی ئاووهەوای شێدار بە ئاوچەی دامەزراندنی پیشەسازی لۆکە چنین ناوبانگی دەرکردبوو لە بەریتانیا :
(یۆرکشایەر – درم – کلیفلاند – لەنکشایەر).

٦٨. ئەو کەرەستە خاوانەی کە زوو لەناو دەچن پێویستە کارگەکانیان نزیك شوێنی بەرهەمهێنانیان بێت وەك پیشەسازی :
(کاغەز – لەقوتونان – چیمەنتۆ – کەلوپەلی کارەبایی).

٦٩. ئەو پیشەسازیانەی کە بەرهەمەکانیان قەبارەیان گەورەیە و هەرزان بەهان وەك پیشەسازی خشت وگەچ جێگیر دەبێت لە نزیك :
(کەرەستەی سەرەتایی – دانیشتوان – بازاڕ – سەرچاوەکانی وزە).

٧٠. پاڵێوگەی شوعەیبە دەکەوێتە پارێزگای : (بەسرە – بەغدا – میسان – سەلاحەددین).

٧١. لە ئەوروپای رۆژئاوادا پاڵێوگەکانی نەوت لە کەنارەکاندا جێگیر دەبن :
(چونکە کانە نەوتیەکان دەکەونە نزیك کەنارەکانەوە – بۆ ئاسان کردنی کرداری ناردنە دەرەوەی پێکهاتەکانی نەوت
– چونکە ئەوروپا گەورەترین بەکاربەری نەوتە – بۆ دوورکەوتنەوە لە پیس بوون).

٧٢. گرنگترین ئەو نیشانانەی کە وڵاتە پێشکەوتوەکانی پیشەسازی لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان جیادەکاتەوە بریتیە لە :
(پێشکەوتنی بنچینەی ژێرخان – جیاوازی لە ئاووهەوا – جۆری بەرهەمی کشتوکاڵی – جۆری خاك).

٧٣. چەرخی کیرۆسین وەك قۆناغێك لە قۆناغەکانی پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت دەکەوێتە نێوان ساڵانی :
(A - ١٧٦٠ – ١٩٠٠ B – ١٨٦٠ – ١٩٠٠ C – ١٦٧٠ – ١٩٠٠ D – ١٦٨٠ – ١٩٠٠).

٧٤. لەم پیشەسازیانەن کە پشت دەبەستن بە دەرهێنراوە نەوتیەکان و گازی سروشتی :
(پوختەکردنی گۆگرد – پەیینی کیمیاوی – داوودەرمان – هەموو وەڵامەکان راستن).

٧٥. پیشەسازی پترۆکیمیاوی پێویستی هەیە بە : (سەرمایەی زۆر – ئامێرومەکینە – بازاڕی فراوان – هەموو وەڵامەکان راستن).

٧٦. پیشەسازی سووکە پێویستی بە رووبەرێکی کەمی زەوی هەیە : (سەعات – فرۆکە – پترۆکیمیاوی – کاغەز).

٧٧. تا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم تاکە سەرچاوەی بەرهەمهێنانی شەکر بووە لە جیهاندا :
(قامیشی شەکر – شێلم – چەوەندەری شەکر – هەموو وەڵامەکان هەڵەن).

٧٨. ئەم پاڵێوگەیە دەکەوێتە باشوری خۆرهەڵاتی بەغدا و ساڵی ١٩٥٥ز تەواو بووە :
(حەدیسە – دۆرە – گەیارە – کەسك).

٧٩. پیشەسازی بنەڕەتی ، غازات و دووکەڵ وبۆنی ناخۆش دەردەدات و ژینگە پیس دەکات ،وەك پیشەسازی :
( پێڵاو – جگەرە – ڕستن و چنین – چیمەنتۆ ).

٨٠. لە چەرخی کیرۆسین خواست زۆر هەبووە لە سەرنەوتی سپی و بەکاردەهات بۆ :
( سووتەمەنی ئۆتۆمبیل – ڕووناك کردنەوە– پیشەسازی – ڕۆنی چەورکردن ).

٨١. ئەو پیشەسازیەی کە ئامێرومەکینەی مەزن بەرهەم دەهێنێت ناسراوە بە پیشەسازی :
( سووك – ئامادەکردن – گۆڕانکاری – قورس ).

٨٢. چەند هاندەرێك هەن پاڵ بە حکومەت ( دەوڵەت ) دەنێن کاتێ شوێنی دامەزراندنی پیشەسازیەکان دەستنیشان دەکات وەك :
( ئەهێڵانی بێکاری لەناوچەیەکدا کەدانیشتوانی زۆرە – هۆی سەربازی ستراتیژی –
پێشخستنی ناوچەیەکی تازە – هەموو وەڵامەکان ڕاستن ).

٨٣. هەندێك پیشەسازی پێویستی بە بڕێکی گەورە لە وزەی کارەبای بەرز هەیە وەك پیشەسازی :
( گۆگرد – ئەلەمنیۆم – فۆسفات – ئاسن ).

٨٤. پیشەسازی پەیکەری فڕۆکە لە وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەکەوێتە :
( باکوری خۆرهەلآت – باشوری خۆرهەلآت – باشوری خۆرئاوا – باکوری خۆرئاوا ).

٨٥. ڕێژەی هەرەزۆری سەرچاوەی سوتەمەنی بەکاردەهێنرێت بۆ مەبەستی پیشەسازی کە دەگاتە نزیکەی :
( ٤/٣ – ٤/٢ – ٥/٣ – ٥/٢ ).

٨٦. چەوەندەری شەکر یەکێکە لە مادده سەرەتاییەکانی پیشەسازی شەکر کە پێویستی هەیە بە :
( سەرمایەکی کەم – ئاووهەوای گەرم –
١٥٠٠ – ٢٠٠٠ ملم لە باران – خاکێکی لیتەیی سوکی تێکەڵ بە لم ودەوڵەمەند بە قسڵ ).

٨٧. پیشەسازی ئاسن و پۆڵا یەکێکە لە جۆری پیشەسازی :
( سووك – بەکاربردن – بنەڕەتی – ئاراستەکراو بەرەوکارگران ).

٨٨. لە بنچینەکانی پیشەسازی پاڵاوتنی نەوتە :
( ڕووبەرێکی فراوانی زەوی هەبێت – بوونی سەرچاوەی ئاوی هەمیشەیی –
دەبێ ئاراستەی با لەبەرچاوبگیرێ – هەموو وەڵامەکان ڕاستن ).

٨٩. لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا :
- بەرهەمهێنان زۆری تێدەچێت هەرچەندە ئاستی کرێ نزم بێت
- دەست کەوتنی کرێکاری مەشق پێکراو ئاسانە
- بە پێشکەوتنی بنچینەی ژێرخان جیادەکرێتەوە
- پرۆژەی پیشەسازی ئەوتۆ هەڵدەبژێردرێت کە ژمارەیەکی کەمی کرێکار بگرێتە خۆی ).

٩٠. پاڵێوگەی حەدیسە لە پارێزگای ئەنبار لە کەلە ساڵی ١٩٢٨ تەواوبووە نەوتی خاوی بۆ دێت لە :
( هێڵی ستراتیژی – رومێەی باشور – کەرکوك – عەین زالە ).

٩١. ڕێژەی شەکر لە کێشی مادده سەرەتاییەکە دەگاتە : ( ٤ – ١٠ ٪ – ١٤ – ٢٠ ٪ – ٢٤ – ٣٠ ٪ – ٢٤ – ٤٠ ٪ ).

٩٢. مەرج نییە ئەم پیشەسازیە لە نزیك کەرستە خاوەکەیەوە دابمەزرێت :
( لەقوتونان – چیمەنتۆ – پاڵاوتنی نەوت – خەستکردنی مس ).

٩٣. شوێنی نمونەیی بۆ پەیدابوونی پیشەسازیە پترۆکیمیاویەکان بریتیە لە وڵاتە :
( پێشکەوتووەکان – تازەپێشکەوتووەکان – بەرهەمهێنەکانی نەوت – ئەوروپیەکان ).

٧٩. پیشەسازی بنەڕەتی ، غازات و دووکەڵ ویۆنی ناخۆش دەردەدات و ژینگە پیس دەکات ،وەك پیشەسازی :
( پێڵاو – جگەرە – ڕستن و چنین – **چیمەنتۆ** ).

٨٠. لە چەرخی کیرۆسین خواست زۆر هەبووە لە سەرنەوتی سپی و بەکاردەهات بۆ :
(سووتەمەنی ئۆتۆمبیل – **ڕووناك كردنەوە**– پیشەسازی – ڕۆنی چەورکردن ).

٨١. ئەو پیشەسازیەی کە ئامێرومەکینەی مەزن بەرهەم دەهێنێت ناسراوە بە پیشەسازی :
( سووك – ئامادەکردن – گۆڕانکاری – **قورس** ).

٨٢. چەند هاندەرێك هەن پاڵ بە حکومەت ( دەوڵەت ) دەنێن کاتێ شوێنی دامەزراندنی پیشەسازیەکان دەستنیشان دەکات وەك :
( ئەهێڵانی بێکاری لەناوچەیەکدا کەدانیشتوانی زۆرە – هۆی سەربازی ستراتیژی –
پێشخستنی ناوچەیەکی تازە – **هەموو وەڵامەکان ڕاستن** ).

٨٣. هەندێك پیشەسازی پێویستی بە بڕێکی گەورە لە ووزەی کارەبای بەرز هەیە وەك پیشەسازی :
( گۆگرد – **ئەلەمنیۆم** – فۆسفات – ئاسن ).

٨٤. پیشەسازی پەیکەری فڕۆکە لە وڵاتەیەکگرتوەکانی ئەمەریکا دەکەوێتە :
( باکوری خۆرهەلات – باشوری خۆرهەلات – **باشوری خۆرئاوا** – باکوری خۆرئاوا ).

٨٥. ڕێژەی هەرەزۆری سەرچاوەی سوتەمەنی بەکاردەهێنرێت بۆ مەبەستی پیشەسازی کە دەگاتە نزیکەی :
( ٤/٣ – ٤/٢ – **٥/٣** – ٥/٢ ).

٨٦. چەوەندەری شەکر یەکێکە لە مادده سەرەتاییەکانی پیشەسازی شەکر کە پێویستی هەیە بە :
( سەرمایەکی کەم – ئاووهەوای گەرم –
١٥٠٠ – ٢٠٠٠ ملم لە باران – **خاکێکی لیتەیی سوکی تێکەڵ بە لم ودەوڵەمەند بە قسڵ** ).

٨٧. پیشەسازی ئاسن و پۆلا یەکێکە لە جۆری پیشەسازی :
( سووك – بەکاربردن – **بنەڕەتی** – ئاراستەکراو بەرەوکارگران ).

٨٨. لە بنچینەکانی پیشەسازی پاڵاوتنی نەوتە :
( ڕووبەرێکی فراوانی زەوی هەبێت – بوونی سەرچاوەی ئاوی هەمیشەیی –
دەبێ ئاراستەی با لەبەرچاوبگیرێ – **هەموو وەڵامەکان ڕاستن** ).

٨٩. لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا :
- **بەرهەمهێنان زۆری تێدەچێت هەرچەندە ئاستی کرێ نزم بێت**
- دەست کەوتنی کرێکاری مەشق پێکراو ئاسانە
- بە پێشکەوتنی بنچینەی ژێرخان جیادەکرێتەوە
- پرۆژەی پیشەسازی ئەوتۆ هەڵدەبژێردرێت کە ژمارەیەکی کەمی کرێکار بگرێتە خۆی ).

٩٠. پاڵێوگەی حەدیسە لە پارێزگای ئەنبار لە کەلە سالی ١٩٢٨ تەواوبووە نەوتی خاوی بۆ دێت لە :
( هێڵی ستراتیژی – رومێەی باشور – **کەرکوك** – عەین زالە ).

٩١. ڕێژەی شەکر لە کێشی مادده سەرەتاییەکە دەگاتە : ( ٤ – ١٠ ٪ – **١٤ – ٢٠ ٪** – ٢٤ – ٣٠ ٪ – ٢٤ – ٤٠ ٪ ).

٩٢. مەرج نییە ئەم پیشەسازیە لە نزیك کەرستە خاوەکەیەوە دابمەزرێت :
( لەقوتونان – چیمەنتۆ – **پاڵاوتنی نەوت** – خەستکردنی مس ).

٩٣. شوێنی نمونەیی بۆ پەیدابوونی پیشەسازیە پترۆکیماویەکان بریتیە لە وڵاتە :
( پێشکەوتووەکان – تازەپێشکەوتووەکان – **بەرهەمهێنەکانی نەوت** – ئەوروپیەکان ).

٩٤. ئەم جۆرە پیشەسازیە پێویستە شوێنەکانیان لەدەرەوەی لەشارەکان بێت :

( چنین – جلوبەرگی ئامادەکراو – **کاغەز** – مۆبیلیات ).

٩٥. ئەو چالاکیانەی کە پەیوەندیان هەیە بە بەدەستهێنانی کەرەستەی خاو بەشێوەیەکی سروشتی، پێی دەوترێ پیشەسازی :

( ئامادەکردن – **دەرهێنان** – گۆڕانکاری – بەکاربردن ).

٩٦. چەرخی گازۆلین کە قۆناغی دووەمی پیشەسازی پاڵاوتنی نەوتە دەستی پێکرد لەسەرەتای سەدەی :

( ١٧ – ١٨ – ١٩ – **٢٠** ).

٩٧. پیشەسازی یاری منداڵان لەو پیشەسازیانەیە کە :

( A – پێویستی بەدەستی کارگەری زۆر نییە B– بەرهەمەکانی زوو لەناودەچن

C– هەریەکە لە B و A ڕاستە **D– هیچ کامیان ڕاست نین** ).

٩٨. لەو پیشەسازیانەی کە پێویستیان بە ئەندازەیەکی کەمی کەرەستەی سەرەتایی هەیە و مەرج نییە لە بازاڕەوە نزیک بن وەك :

( A – پیشەسازی پلاستیك B– پیشەسازی کەلوپەلی کارەبایی

C– پیشەسازی جلوبەرگی ئامادەکراو **D– هەریەکە لە B و A ڕاستە** ).

٩٩. ناوچەی لەنکشایەر لە بەریتانیا لە پیشەسازی چنینی لۆکەوە گۆڕا بۆ :

( **پیشەسازی کارەبا** – پیشەسازی کەشتی – پیشەسازی چیمەنتۆ – لەقوتونان ).

١٠٠. بە یەکێ لەو پیشەسازیانە دادەنرێت کە ڕێژەی کێشی وون بووی زۆر کەم تێدایە :

( چیمەنتۆ – **پاڵاوتنی نەوت** - خەست کردنی مس – شەکر ).

# بەشی حەوتەم/ بازرگانی وگواستنەوە

هۆ/ بازرگانی و گواستنەوە دوو پیشەی تەواوکەری بەرهەم هێنانن ( یەکترن ) ؟

چونکە هەر کەرستەیەکی بەرهەم هێنراو تا نەگوێزرێتەوە بۆ بەکاربەر یا هیچ نەبێ بۆ بازاڕ ، ئەوا نرخی ئابووری نیە .

ئابووری خۆبەش ( خۆژێنی ) : بریتیە لەو بازرگانیەی کە لە سنووریکی تەسکدا دەکرا لە نێو ئەو کۆمەڵگا سەرەتاییانەی کە بە ئاژەڵ بەخێوکردن و کشتوکاڵەوە خەریك بوون چونکە کۆمەڵگای ڕاووشکار و کۆکردنەوە بوون. تا ئێستاش کۆمەڵگا سەرەتاییەکان هەرلەسەر ئەم شێوەیە دەژین .

قۆناغەکانی گەشەکردنی بازرگانی :

١- قۆناغی یەکەم ( ڕژێمی شت گۆڕینەوە ) : بریتیە لە ئاڵوگۆڕی شت بە شت گۆڕینەوە ، کە ئەم شمەك و کەرەستە گۆڕینەوەیەش لە زۆربەی کاتدا لە سنووریکی تەسکی ناوخۆیی دەکرا .

٢- قۆناغی دووەم (ئابووری ئاڵوگۆڕکاری): بریتیە لەو ڕژێمەی دوای پەیدا بوونی قەوارە ڕامیاریەکان بەتایبەتی دەوڵەتە نەتەوەییەکان پەیدا بوو کە ئەوە بوو ئاڵوگۆڕی شمەك و کەرەستە لەناو خودی یەك دەوڵەتدا زیادی کرد ،بەتایبەتیش دوای دەرکردنی پارە (سکەلێدان) و زۆر بوونی چڕی هۆ و پێناوەکانی گواستنەوە و شێوە جۆربەجۆرەکانی،بازرگانی زیاتر گەشەی کرد .

| ئابووری خۆبەش ( خۆژێنی ) | ئابووری ئاڵوگۆڕی |
|---|---|
| ١- لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا دەکرێ کە بە ئاژەڵ بەخێوکردن و کۆکردنەوە خەریك بوون . | ١- لەدوای پەیدابوونی قەوارە ڕامیاریەکان بەتایبەتی دەوڵەتە نەتەوەییەکان پەیدا بووە . |
| ٢- بازرگانی لە شێوەی گۆڕینەوەی شت بە شت ( شمەك و کەرەستە گۆڕینەوە ) دایە . | ٢- بازرگانی زیاتر گەشەی کرد دوای دەرکردنی پارە و زۆربوونی چڕی هۆ و پێناوەکانی گواستنەوە . |
| ٣- بازرگانی لە سنووریکی تەسکدا دەکرا لە چوارچێوەی ناوخۆییدا . | ٣- بازرگانی بە شێوەیەکی فراوان دەکرێت لە نێوان وڵاتان و لە نێوان ناوچە دوورەکان . |
| ٤- دابڕاوە لە ئابووری جیهانی . | ٤- پەیوەندی بە ئابووری جیهانیەوە بەهێزە . |

ڕامیاری دەرگای داخراو(کلۆم کراو) : زۆربەی دەوڵەتانی جیهان دەیانەوێ پارێزگاری لە ڕژێمی ئابووری تایبەتی و جودای خۆیان بکەن بە دانانی یاسای گومرگی قەدەغەکار و یاساکانی سەودا و مامەڵەنەکردنی بازرگانی هەروەك هەندێك لە دەوڵەتان پەیڕەویان کرد لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم وسەرەتاکانی سەدەی بیستەم .

٣- قۆناغی سێیەم : دۆزینەوە جوگرافیەکان کە لە کۆتاییەکانی سەدەی پازدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی شازدەهەم هاتنەکایەوە ، گۆڕمیکی نوێیان بە ئاڵوگۆڕی بازرگانیدا و سنووری بازرگانیان فراوانتر کرد ؟

چونکە ① جیهانێکی نوێ دۆزرایەوە و زەریای ئەتلەسی بوو بە زەریایەکی ناوەند و گواستنەوەی دەریایی تیایدا چڕتر بوو .

② دەرکەوتنی بازرگانی کۆیلە و فراوان بوونی دەسەڵاتی ئیستیعمار ، دوو دیاردەی سەرەکی بوون کە شان بە شانی پەیدا بوونی ئەو گەلانەی بە بازرگانیەوە خەریك بوون ، دەرکەوتن ، وەك پورتوگالی و ئیسپانی و ئینگلیزەکان .

٤- قۆناغی چوارەم : ئەو ئینقلابە (شۆڕش)ە پیشەسازیەی کە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم ( ١٧٦٠ ) ڕوویدا کاریگەرێتی زۆری هەبوو بۆ سەر فراوان بوونی بازرگانی ؟ ( ئەمە ڕوون بکەرەوە ) .

چونکە ① جیمس وات توانی سوود لە هێزی هەڵم وەربگرێت بۆ هەڵسوڕاندنی ئامێرەکان،ولە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم بۆهۆیەکانی گواستنەوەی دەریایی ووشکانی بەکارهێنرا،بەم پێیە توانای هەڵگرتن وخێرایی هۆوپێناوەکانی گواستنەوە زیادی کرد.

② بەهۆی داهێنراوە نوێیەکانیش مرۆڤ توانی دەست بگرێت بەسەر پاراستنی پلەی گەرمای سایلۆ (کۆگا) گەورەکاندا، وەبەهۆی هێنانەکایەی شێوەکانی خێراترکردنی گواستنەوە توانیان زاڵ بن بەسەر ئەو کۆسپانەی کە ڕێگر بوون لەبەردەم زیادکردنی قەوارەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی .

③ بازرگانی ڕاستەوخۆ بەستراوەتەوە بە زێدە بەرهەم و ئارەزووی بەکاربردن .

## هۆیەکانی پەیدا بوونی بازرگانی :

١- **جیاوازی دابەشکردنی دەرامەتە سروشتیەکان** : دەرامەتە سروشتیەکان بە شێوەیەکی عادیلانە لەسەر گۆی زەوی دابەش نەکراوە ، چونکە خاکی بە پیت کە توانای بەرهەم هێنانی چەند جۆرێك بەروبوومی کشتوکاڵی هەبێ تەنها لە چەند ناوچەیەکی دیاریکراودا نەبێ ،نیە . ئەو زەویانەش کە بە کەڵکی کشتوکاڵ دێن تەنها ٤٠٪ی ڕووبەری ووشکانی دەگرنەوە کە ئەگەر ناوچە جەمسەریەکانیشی لێ دەرکەین ،هەروەها ئاووهەوای لەبار و گونجاو بۆ کشتوکاڵ و بەرهەمی ئابووری لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی تر جیاوازە ، کانزاکانیش هەروەك ئاشکرایە هەر تەنها لە چەند ناوچەیەکی دیاریکراوی جیهان دا هەن .

**هۆ/ جیاوازی کاتی دروێنەی دەغڵ و دان یارمەتی ئاڵوگۆڕی بازرگانی دەدات لە نێوان وڵاتان ؟**

چونکە گەنم لە نیوەی باشووری گۆی زەوی لە سەرەتاکانی هاوینی باشوور ، یاخود لە سەرەتاکانی زستانی باکوور پێ دەگات ، کە ئەمەش لە کاتێکدایە کە گەنم لە نیوەی باکووری گۆی زەوی نامێنێ ، بۆیە ئەو دەوڵەتانەی کە دەکەونە نیوەی باکووری گۆی زەوی پشت دەبەستن بە کڕین و هێنانی گەنم لە ئوستـراليا و نیوزلەندە و ئەرجەنتین .

٢- **جیاوازی دابەش بوونی دانیشتوان** : دانیشتوان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك لەسەر ڕووی زەویدا دابەش نەبوون ، چونکە ٢/١ ی دانیشتوانی جیهان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا جێگیرن و ، نزیکەی ٤/١ ی دانیشتوانی جیهان لە ئەوروپا ، لە کاتێکدا جیهانی نوێ کە ڕووبەرەکەی بەقەد هەموو ڕووبەری ئاسیایە کەچی تەنها چارەگێکی دانیشتوانی ئاسیای لێ دەژی . ئەو ناوچانەش کە دانیشتوانیان چڕە تەنها بەو بەرهەمە ناژین کە لە زەویەکانیاندایە لە خۆراك و کەرەستە ، بۆیە ناچار دەبن بۆ پڕکردنەوەی کەم و کووڕیەکانیان بە ئاڵوگۆڕی بازرگانی بژین .

٣- **جیاوازی ئاستەکانی داهات و بژێوی** : مەبەست لە داهاتی نەتەوە سەرجەمی بەهای ئەو بەرهەمە نەتەوەییە یە کە لە کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی و خزمەتگوزاری و هی تر لە ماوەی ساڵێکدا دێتە دەست ، ناوەندە بەشی تاکە کەسیش لە داهاتی نەتەوە دەتوانین دەری بێنین بەهۆی دابەشکردنی سەرجەمی داهاتی نەتەوە بەسەر ژمارەی دانیشتوان ، واتە :

$$\text{داهاتی تاکەکەس} = \frac{\text{سەرجەمی داهاتی نەتەوە}}{\text{ژمارەی دانیشتوان}}$$

**هۆ/ داهاتی نەتەوە یەکێکە لەو پێوانە گرنگانەی کە بازرگانی و دانیشتوان پێکەوە دەبەستێت ؟**

چونکە تا سەرجەمی داهاتی نەتەوە زیاتر بێت و ژمارەی دانیشتوانیش کەم بێت ئەوا ناوەندەبەشی تاکەکەس لە داهاتی نەتەوەیی و لەبازرگانی دەرەکی ئەو دەوڵەتە زیاتر دەبێت . بۆنمونە ئەو دەوڵەتە پیشەسازیانەی کە ئاستی بژێوی تێیدا بەرزە ( وەك وڵاتەکانی خۆرئاوای ئەوروپا و ژاپۆن ) بۆ زۆربەی پێویستیەکانیان پشت بە هاوردەنی دەبەستن چونکە دەتوانن بەو دراوە گرانبەهایانەی کە هەیانە، خەرجیی ئەو هاوردەنی یە پڕبکەنەوە. هەندێ دەوڵەتی تریش لە ئاستێکی بژێوی بەرزتردان ( وەك کەنەدا وئوستراليا ونیوزلەندا ) کە ڕووبەری زەوی فراوان و دەرامەتی هەمەچەشنەیان هەیە و ژمارەی دانیشتوانیشیان کەمە، بۆیە ناوەندە بەشی تاکەکەس لە بازرگانی لەکەنەدا نزیکەی ٧٠٠ دۆلارە لەساڵێکدا ولەئوستراليا ٤٣٠ دۆلارە .بە پێچەوانەشەوە ناوەندەبەشی تاکەکەس کەم دەبێتەوە لەبازرگانی دا لەو دەوڵەتانەی ئاستی بژێوی تێیدا نزمە، بۆیە ناوەندە بەشی تاکەکەس لە بازرگانی لەهیندستان ١٠ دۆلارە لە ساڵێکدا و لە پاکستان١٨دۆلارە.

٤- سیستەمی ئابووری : ئەو رژێم ( سیستەم )و رامیاریە ئابووریانەی کە دەوڵەتە هەمەچەشنەکان پیادەی دەکەن ، راستەوخۆ بێ یان ناراستەوخۆ کاردەکەنە سەر بازرگانی نێوان دەوڵەتان ؟

أ - بەهۆی دارشتنی یاساکانی بازرگانی و سەپاندنی رەسمی گومرگی بەرز بۆ ئەوەی بەرهەمەکانی ناوخۆیان بپارێزن لە رکابەرایەتی بەرهەمەکانی وڵاتانی تر ، و دەرگا دادەخەن لە رووی لێشاوی بازرگانی دەوڵەتان .

ب- هەندێک دەوڵەت رژێمی بەش بەش دادەنێن تا سنوورێک بۆ چەندێتی و نرخی هاوردەنەکان و چۆنێتی سەرچاوەکانی دابنێ.

ج- هەندێک دەوڵەتی تر پەنا دەبەنە بەرسیاسەتی پاراستنی نرخ بەوەی بەرهەمەکان کەم دەخەنە بازار ، جا چ هەڵی دەگرن یان لەناوی دەبەن، بۆنموونە بەرازیل برێکی زۆری بەرهەمی قاوەی لەناوبرد بۆ ئەوەی پارێزگاری نرخەکەی بکات ونەهێڵێت دابەزێت.

٥- ئاسانی گواستنەوە : هۆ وپێناوەکانی گواستنەوە رۆڵێکی گەورەیان بینی لە گەشەسەندنی بازرگانی دەوڵەتان ؟

أ - راکێشانی هێڵی ئاسن و پێشکەوتنی رێگاکانی سەر وشکانی و هەڵکەندنی نۆکەند بۆ کەشتیوانی و بەکارهێنانی دەریا و زەریاکان بۆ گواستنەوە بە نرخێکی کەم ،کەلوپەلێکی زۆری بە رێگای دوورودرێژدا دەگواستەوە تەنانەت بە سایەی ئەم هۆ و پێناوانەی گواستنەوە توانرا دەرامەتی ئابووری ئەو ناوچە دوورانەی کە مرۆڤ دەستی نەدەگەیشتێ بەکاربهێنرێت و وەبەر بهێنرێت ئەمەش بووە هۆی زیاد بوونی بەرهەمی کشتوکاڵی و کانزایی و پیشەسازی .

هۆ/ وەبەرنەهێنانی زۆر لای حەوزی ئەمەزۆن و کۆنگۆ وناوچە دوورەکانی سیبیریا ؟

بەهۆی نەبوونی رێگاوبان و هۆوپێناوەکانی گواستنەوە .

ب- پێناوەکانی ساردکردنەوەی گەرۆک یارمەتی ئەوەیان داکەبەروبوومەساردوبەستراوەکان بتوانرێت بگوازرێتەوەبۆناوچە دوورەکان.

ج- گرنگترین پێشکەوتن لەبواری گواستنەوەدا لەسەدەی بیستەم بەکارهێنانی گواستنەوە بوو بە ئۆتۆمبێل ؟

چونکە کرداری بارهەڵگرتن و داگرتنی ئاسان کرد لەو ناوچانەی کە کەرستە خاوەکەی تێدابوو یاخود ئەو ناوچانەی کە شمەکی دروستکراوی تێدا کۆبۆتەوە، ئیتر یەکسەر دەگوازرایەوە بۆ شوێنی بەکاربردن وبازار بۆ ساغ کردنەوە و فرۆشتنی بە شێوەیەکی خێرا و ئاسان ، بەمەش هۆی گواستنەوە گەیشتە ئەو ناوچانەی کە ئاشنانین بە نۆکەند و هێڵی ئاسن .

نۆکەندی سوێس :

فردیناند دیلیسبس : ئەو ئەندازیارە فەرەنسیە بوو کە خاوەنی بیرۆکەی هەڵکەندنی نۆکەندی سوێس بووکە ساڵی ١٨٦٩ کرایەوە بۆ بەستنەوەی دەریای سوور بە دەریای ناوەراست .

گرنگیی کردنەوەی نۆکەندی سوێس :

١- لە رووی جوگرافیاوە : بە گرنگترین نۆکەند دەژمێردرێت کە مرۆڤ هەڵی کەندبێت بە مەبەستی بەستنەوەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بەیەکتریەوە لە کورتترین رێگا و تەسکترین پارچە زەوی لە نێوان ئاسیا و ئەفریقیا و هاوسێی ئەوروپا .

٢- لە رووی ئابووریەوە : ماوەی گواستنەوە و کرێ وخەرجیی گواستنەوەی کەم کردەوە و چالاکی بازرگانی گێرایەوە بۆ بەندەرەکانی دەریای ناوەراست بەهۆی ئەوەی کە پەکیان کەوتبوو پاش دۆزینەوەی رێگای ( رأس الرجاء الصالح ) .

٣- لە رووی ئاوەدانیەوە : کردنەوەی نۆکەندی سوێس بووە هۆی دروست بوونی گەلێک بنکەوبەندەری ئاوەدانی گرنگ لە هەردوو لای و لە کەنارەکانیدا وەک ( شارەکانی پۆرسەعید و ئیسماعیلیە و سوێس ) .

نۆکەندی ( سوێس ) ی نوێ

نۆکەندی سوێسی نوێ لقێکی نوێی نۆکەندی سوێسە درێژیەکەی لە ٦١کم کرا بە ٩٥کم ، لە ٦ ی ئابی ٢٠١٥ز لەبەردەم کەشتیوانی جیهانی کرایەوە بە درێژایی ٣٥کم ، جگە لە فراوانکردن و قوڵکردنی لقەکانی دەریاچەی مورە و بەلاح کە درێژیەکەی ( ٣٧کم ) ە، سەرجەمی درێژی پرۆژەکە بوو بە ٧٢کم ، واتە درێژیەکەی لە ٥٠ کم کرا بە ١٢٢کم. ئامانج لە هەڵکەندنی نۆکەندی سوێسی نوێ، بۆ نەهێشتنی ئەو تەگەرانە بوو کەلە نۆکەندە کۆنەکە دووچاری کەشتیوانی دەبۆوە. کاروانی کەشتیەکانی لای دەستەچەپ دەبوایە پتر لە ١١ کاتژمێر لە دەریاچەی مورە چاوەروانیان بکردایە. ٤ ملیار دۆلاری تێچووە، وا پێشبینی دەکرێت لە ئایندە داهاتی نۆکەندی سوێس بە رێژەی ( ٢٥٩٪ ) بەرزبکاتەوە.


البحر الأبيض المتوسط
MEDITERRANEAN SEA
بور سعيد
Port Said
الرسوة
Raswa
راس العش
Ras El Ish
التينه
Tinah
الكاب
Cap
القنطرة
Kantara
Ballah by-pass
البلاح
Ballah
N
NW
NE
W
E
SW
SE
S
الفردان
Ferdan
الإسماعلية
Ismailia
بحيرة التمساح
Lake Timsah
طوسوم
Toussom
دفرسوار
Deversoir
البحيرات المرة الكبرى
Great Bitter Lake
كبريت
Kabrit
جنيفه
Gineifa
الشلوفة
Shallufa
السويس
Suez
Port Tawfiq
قناة ملاحية جديدة
New Canal
تعميق وتوسيع
Deepening & widening
خليج السويس
اليوم السابع
www.youm7.com

| گواستنەوە لە ڕێگای کاب ( رأس الرجاء الصالح ) | گواستنەوە لە ڕێگای نۆکەندی سوێس |
|---|---|
| ١- ڕێگای ئاوی دەبوایە بەدەوری هەموو قارەی ئەفریقیادا بسووڕێتەوە. | ١- ٢/٣ ی ماوەکەی لە ئەوروپا بۆ ئاسیا کەم کردەوە . |
| ٢- گەشتی دەریایی لەم ڕێگایەوە ( ٢١ ) هەزار کم بوو لە نێوان ( لەندەن ) و ( بەندەری فاو ) . | ٢- گەشتی دەریایی لەم ڕێگایەوە بە ( ١٢ ) هەزار کم بوولە نێوان ( لەندەن ) و ( بەندەری فاو ) . |
| ٣- گەشتی دەریایی لەم ڕێگایەوە ( ٧١ ) ڕۆژی دەخایاند لە نێوان ( لەندەن ) و ( بەندەری فاو ) . | ٣- گەشتی دەریایی لەم ڕێگایەوە ( ٤٥ ) ڕۆژی دەخایەند لە نێوان ( لەندەن ) و ( بەندەری فاو ) . |
| ٤- خەرجی ( تێچوونی ) گواستنەوە و گەشتی دەریایی زۆر بوو . | ٤- خەرجی ( تێچوونی ) گواستنەوە و گەشتی کەم کردەوە . |
| ٥- بەندەرەکانی دەریای ناوەڕاست پەکیان کەوتبوو . | ٥- بەندەرەکان بوون بە وێستگەی سووتەمەنی و ڕاژە . |
| ٦- کەشتیەکان سووتەمەنی زۆرتریان هەڵدەگرت و کەمتر شمەك و کەرەستەیان هەڵدەگرت . | ٦- کەشتیەکان سووتەمەنی کەمتریان هەڵدەگرت و شمەك و کەرەستەی زۆرتریان هەڵدەگرت . |

## نۆکەندی کیڵ

نۆکەندی کیڵ هەردوو دەریای باکور و بەڵتیق بەیەك دەگەیەنێ، درێژیەکەی ( ٩٨کم ) ە، ودووری ٥١٩کم کەمدەکاتەوە، لەساڵی ١٧٨٤ز کاری نۆکەندەکە تەواوبووە، ئەوکات درێژیەکەی ٤٣کم و پانیەکەی ٢٩کم وقوڵیەکەی ٣م بوو، تەنها بۆ تێپەڕبوونی ئەو کەشتیانە بوو کە کێشیان لە ٣٠٠تەن پتر نەبوو. ئامانج لە هەڵکەندنی ئەو نۆکەندە سەرەتا تەنها بۆ مەبەستی سەربازی بوو چونکە ئەڵمانیەکان دەیانویست دووری نێوان بنکە سەربازیەکانیان لە دەریای بەڵتیق لەگەڵ بنکە سەربازیەکانیان لە دەریای باکورکورتبکەنەوە پێش ئەوەی بە دەوری دانیمارکدا بسوڕێتەوە. لەساڵی ١٨٨٧ز نۆکەندێکی نوێیان هەڵکەند، کاوەی هەشت ساڵی برد، نزیکەی ٩٠٠٠کرێکارکاریان تێداکردووە. لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە پەیمانی ڤرسای نۆکەندی کیڵ لەبەردەم کەشتیوانی نێودەوڵەتی کرایەوە، بەڵام هەرلەژێردەسەڵاتی ئەڵمانیادابوو، لە ساڵی ١٩٣٦ز هیتلەر کەشتیوانی نێودەوڵەتی نەهێشت، لەدوای جەنگی جیهانی دووەم دووبارە بەڕووی کەشتیوانی نێودەوڵەتی کرایەوە.



## نۆکەندی پەنەما

ڕێڕەوێکی ئاوییە،بەرزاییەکانی پەنەما دەبڕێت،هەردوو زەریای ئەتڵەسی و هێمن بەیەك دەگەیەنێ،گەورەترین بەدەستهێنانی ئەندازیاریە لە جیهاندا،لەدوای ساڵی ١٩١٤ز کەناڵەکە پێشوازی لە کەشتیوانی جیهانی کردووە،دووری گەشتی کەشتیگەلی نێوان شاری نیویۆرك لەکەنارەکانی باکوری خۆرهەڵات وشاری سانفرانسیسکۆ لە کەنارەکانی خۆرئاوای ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای کورت کردەوە بۆ کەمتر لە ٨٣٧٠کم کە پێش هەڵکەندنی ئەم نۆکەندە بۆ هەمان گەشت دەبوایە بە دەوری ئەمریکای باشور بسوڕێتەوەو نزیکەی (٢٠٩٠٠کم ) ی دەبڕی.لەسەرەتای دروستکردنی نۆکەندی پەنەما ساڵانە توانای گوزەرکردنی ١٠٠٠ کەشتی هەبوو لە ڕۆژێکدا ، لەساڵی ٢٠٠٨ز بۆ ١٤٧٠٢ کەشتی بەرزبۆوە.ئەم نۆکەندە لەلایەن ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەڵکەندراوە،٣٨٠ ملیۆن دۆلاری تێچووە،جگەلەوەی کە بەهەزاران کرێکار بۆ ماوەی ١٠ ساڵ کاریان تێداکردووە.جیاوازی ئەم نۆکەندە لەگەڵ ئەوانی دیکە ئەوەیە کە ڕێکخەر وناوەندی دەست بەسەرداگرتنی تایبەتی هەیە،ڕێڕەوی نۆکەندەکە ٢٥م لە ئاستی ئاوی ڕووی دەریا بەرزترە،تەنها بۆ کەشتی قەبارە تایبەتە،سەرەتا فەڕەنسیەکان بەم کارە هەڵسان،بەڵام لە١ ئابی ١٩٠٢ز ئەمەریکیەکان مافی نۆکەندەکەیان لە فەڕەنسیەکان کڕیەوە،بە پێی ڕێکەوتنی هەردوو ولآت لە ساڵی ١٩٧٨ز نۆکەندەکە کەوتە ژێر دەسەڵاتی ولآتە یەکگرتووەکان.لە ساڵی ١٩٩٩ز لە دوای ٨٥ ساڵ نۆکەندی پەنەما گەڕیەوە ژێر دەسەڵاتی ولآتی پەنەما،ساڵانە ١٤ هەزار کەشتی پێدا تێدەپەڕێت.




**گەروو** : بەو ڕێڕەوە ئاویە تەنگانە دەڵێن کە دوو بەشی زەویەك لە یەکتر جیادەکاتەوە و دوو ڕووبەرە ئاویش بە یەك دەگەیەنێ، جا هەندێ جار ئەم گەروانە دەکەونە نێو سنووری دەوڵەتێك هەندێ جاریش دوو دەوڵەت یان زیاتر .

**گەرووی جەبەل تاریق** : گرنگترین گەرووی نێودەوڵەتیە کە هەردوو قارەی ئەوروپا و ئەفریقیا لێك جیا دەکاتەوە ، زەریای ئەتلەسی لە خۆرئاوا و دەریای ناوەڕاست لە خۆرهەڵات بە یەك دەگەیەنێ . درێژیەکەی لە نێوان سەری ترافلگار و سەری سپارتڵ لە لای خۆرئاواوە تا دەگاتە تاوێری جەبەل تاریق و هەرێمی ئیسپانی ( سەبتە ) لە لای خۆرهەڵاتەوە (٥٣ کم ) دەبێ ، بەڵام پانیەکەی لەو سەری خۆرئاوای دا( ٣٨ کم ) و لەو سەری خۆرهەڵاتیدا ( ٢١ کم ) دەبێ . تەسکترین بەشی گەرووی جەبەل تاریق دەکەوێتە لای هەرێمی ئیسپانی (سەبتە ) کە دەگاتە ١٢ کم .ناوەکەشی لە سەرکردەی موسوڵمان ( تاریقی کوڕی زیاد ) هاتووە کاتێ بۆ گرتنی ئەندەلوس ( ئیسپانیا ) لەو گەرووە پەڕیەوە .




**گەرووی هورمز** : ئەو گەرووەیە کە هەردوو کەنداوی عەرەب و کەنداوی عوممان بەیەکەوە دەگەیەنێ و کەنارەکانی ئێران دەکەوێتە باکوورییەوە و ، کەناراوەکانی عومانیش دەکەوێتە باشوورییەوە .

**سەری مسندم**:کەنارەکانی باشووری گەرووی هورمزە کە سەربە وڵاتی عومانە کە ( ٤٨ کم ) پانە وتەسکترین جێی ( ٣٣.٢ کم ) دەبێت.

**گەرووی قلارانس ( کلارانس )** : ئەو گەرووەیە کە دورگەی کیشم ( قشم ) و کەناری ئێران لەیەکتر جیادەکاتەوە و ، گەروویەکی تەسک وپڕ چەڵەمەیە و بە کەڵکی کەشتیوانی نایەت ، درێژییەکەی ( ٤١.٦ کم ) دەبێ بەڵام پانییەکەی ( ٢٦ کم ) دەبێ ، قووڵییەکەشی ( ٩ – ٥٠ ) بالای دەریاییە .

**هۆ/ دەریا ڕەوی لە گەرووی هورمز گەلێک تەگەرەی دێتە پێش ؟**

و/ ① / شەپۆلەکانی زۆر بەرز و نزم وبەهێزن . ② چەماندنەوە و چاڵ و چۆڵی زۆرە . ③ گەرووەکە شۆستەی نیە .

**بۆشایی/** لە گرنگترین دورگەکانی گەرووی هورمز : هورمز و لارك و هینجام و الطنب ی بچوگ و الطنب ی گەورە .

**هۆ/ دوورگەی الطنب الصغری فەنەر و ڕووناکی بەخشی ڕێنیشاندەری بەهێزی تێدایە ؟**

و/ بۆ ئەوەی یارمەتی کەشتیوانی شەوانە بدات لە گەرووی هورمز .






**گەرووی باب المندب** : ئەو گەروەیە کە لە باکوورەوە دەریای سوور و ، لە باشووریشەوە زەریای هیندی ( دەریای عەرەب و کەنداوی عەدەن ) بەیەکەوە دەگەیەنێ و لە ڕۆژهەڵاتەوە قارەی ئاسیا و لە ڕۆژئاواوە قارەی ئەفریقیا لەیەکتر جیادەکاتەوە ، لە کۆندا پێیان دەوت دەرگەی ( وەفا ) یاخود ( پابەندی = الولاء ) .

**هۆ/ پێشان بە گەرووی ( باب المندب )یان دەووت ( دەرگەی فرمێسک ) ؟**

و/ ① لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێ کە دەریاڕەوی تیایدا زۆر سەغڵەتە ئیتر مایەی خەم و ناخۆشی بوو .

② یاخود لەبەر ئەوە بووبێ کە خەڵکی یەمەن وەڕس ببوون لە پاسەوانێتی لە دژی داگیرکەران .

**دورگەی برێم ( ئامیون ) کە سەر بە وڵاتی (یەمەن) ە گەرووی باب المندب دەکات بە دوو ڕێگە :**

١- ڕێگەی خۆرهەڵاتی ( **گەرووی ئەسکەندەر**) : ئەم گەرووەیەکە دەکەوێتە نێوان کەناری یەمەن و دوورگەی برێم ( ئامیون )، درێژیەکەی ( ٤.٨ کم ) دەبێ و پانیەکەی ( ٢ کم ) زیاترە .

٢- ڕێگەی خۆرناوای ( **ڕێگەی میۆن** ) : ئەم ڕێگەیە دەکەوێتە نێوان کەنارەکانی ئەریتریا وجیبۆتی لە لایەك و کەنارەکانی دوورگەی برێم ( ئامیۆن ) لە لایەکی ترەوە ، درێژیەکەی ( ١٦ کم ) دەبێ ، پانیەکەی ( ١٦.٨ کم ) دەبێ .

**سەری مەنهالی** :کەناری ئاسیایە لە گەرووی ( باب المندب ) سەر بە وڵاتی یەمەن.

**سەری سیان** :کەناری ئەفریقیایە لە گەرووی ( باب المندب ) سەر بە وڵاتی جیبۆتی.

**هۆ/ گەرووی باب المندب بە گرنگترین شوێنی ستراتیژی جیهانی دەژمێردرێت ؟**

چونکە دوایین پلەی باشووری دەریای سوور پێکدەهێنێ و دەرگای دەریای سووریشە بۆ سەر زەریای هیندی ، و ڕێگە دەریاییەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرناواش هەرلەم گەرووەوە تێدەپەڕن،هەروەها دەرگای پشتەوەی ئۆکەندی سوێسیشە کە دەکەوێتە سەرەتای دەریای سوور.




**گەرووی دەردەنێل** : ئەم گەرووە تورکیەیە کە دەریای ئاوەڕاست ( دەریای ئیجە ) ودەریای مەڕمەڕە بەیەکەوە دەگەیەنێ ، درێژیەکەی ( ٥٧.٦ کم ) دەبێ و قوڵاییەکەی ( ٢٥ – ٥٠ ) باڵای دەریاییە .

**هۆ/ لایەنی بەری ئاسیایی گەرووی دەدەنێل چاکترە بۆ دەریاوانی لە لایەنی بەری ئەوروپایی ؟**

چونکە بەری ئەوروپایی زۆر لێژە .

**دەریای مەڕمەڕە** : ئەو دەریایە تورکیەیە کە هەردوو گەرووی بۆسفۆر و گەرووی دەردەنێل بە یەکەوە دەگەیەنێ ، درێژی ( ٢٤ کم ) دەبێ و پانیەکەی لە نێوان ( ٣٢ – ٤٢ کم ) دەبێ ، قووڵاییەکەی ( ١٥ – ٤٠ ) باڵای دەریاییە .

**هۆ/ دەریاڕەوی لە دەریای مەڕمەڕە بێ مەترسیە تەنیا لە کۆتایی بەشی باشووری خۆرئاوای نەبێ ؟**

و/ چونکە لەم بەشەیدا ئاوەکەی لیخنە ( تەنکاوە ) .

**بۆشایی**/لە گرنگترین بەندەرەکانی دەریای مەڕمەڕە لە بەری ئاسیا **گەملیك** و **ئیزمیت** ، بەڵام لە گرنگترین بەندەرەکانی دەریای مەڕمەڕە لە بەری ئەوروپا **تیکیرداغ** .

**گەرووی بۆسفۆر** : ئەم گەرووە تورکیەیە کە هەردوو دەریای مەڕمەڕە و دەریای ڕەش بەیەکەوە دەگەیەنێ و هەردوو بەشی تورکیای ئاسیا و تورکیای ئەوروپا لە یەکتر جیا دەکاتەوە ، درێژیەکەی ( ٢٧.٢ کم ) دەبێ و پانیەکەی لە نێوان ( ١.٦ – ٣.٦ کم ) دەبێ .

**ملەی زێڕین (القرن الذهبي)** : کەنداوێکی بچووکە کە مۆنگەی( بەندەری ) ئەستەنبوڵی لەسەرە لەناو گەرووی بۆسفۆر لەبەری ئەوروپا، درێژیەکەی ( ٣ میل ) ە ، پانیەکەی چارەگە میلێکە ، قووڵاییەکەی ( ٤٠ ) باڵای دەریاییە .

**هۆ/ دەریاڕەوی لە گەرووی بۆسفۆر مەترسی زۆرە و بە شەو ناهێڵن پێیدا بڕۆن ؟**

و/ چونکە ژمارەیەکی زۆر سیمی دەریایی وکێبڵی تێدایە کە کارێکی وای کردووە دەبێ کەشتیەکان بەخێراییەکی دیاریکراو پێیدا بڕۆن .

**بۆشایی** / بەندەرە سەرەکیەکانی گەرووی بۆسفۆر **ئەستەنبوڵ** لە بەری ئەوروپا و **حەیدەرپاشا** لە بەری ئاسیا .

**پەیمانی کوچك کینارچی** : ئەو پەیمانە بوو کە ڕوسیای قەیسەری سەپاندی بەسەر سوڵتانی عوسمانی ساڵی ١٧٧٤ بۆ ئەوەی دەریای ڕەش و گەرووە تورکیەکان کراوە بن لەبەردەم پاپۆرە بازرگانیەکانی ڕووسی ، دوای ئەوە ڕوسیا توانی دەست بگرێت بەسەر **نیمچە دورگەی قرم** لە باکوری دەریای ڕەش لە سەدەی هەژدەهەم وسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم.




## گەرووی مەلەقا

ڕێڕەوێکی ئاوی سروشتیە دەکەوێتە باشوری خۆرهەلاتی ئاسیا ،نیمچە دورگەی مالیزیاو دورگەی سۆمەترەی ئەندەنوسیا لێک جیادەکاتەوە. لەلای باکوری خۆرئاوا دەریای ئەندومان لە زەریای هیندی لەگەڵ دەریای چین لەلای باشوری خۆرهەلات بەیەک دەگەیەنێ،درێژی ٨٠٠کم وپانی لەنێوان ٥٠–٣٢٠کم دایە .گەرووی مەلەقا ڕێڕەوێکی سەرەکیە بۆ گواستنەوەی نەوت بۆ ولاَتانی چین و ژاپۆن کە ئەمرۆ گەورەترین بەکاربەری نەوتن لە جیهان.گەورەترین بەندەریش کەدەکەونە سەر ئەم گەرووە بریتین لەهەردوو بەندەری مەلەقای مالیزی و سەنگافورە.

## گرنگی شوێنی گەرووی مەلەقا

گەرووی مەلەقا ڕێڕەوێکی ئاویی جیهانییە لەبەردەم کەشتیوانی ( جوڵەی کەشتیوانی گەرووی مەلەقا بەهاوتای جوڵەی کەشتیوانی نۆکەندی سوێ دەخەملێنرێت ) چوار لە چڕترین ولاَتی جیهان لە ڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە پێک دەگەیەنێت( چین،هیندستان،ژاپۆن،ئەندەنوسیا ).ئەم داتایانە ئاماژە بە گرنگی ئەم گەرووە دەکەن :

١. ساڵانە پتر لە ٥٠٠٠٠ کەشتی پێیدا تێدەپەڕێت.
٢. ٢٠ – ٢٥ ٪ ی کەشتیوانی جیهانی تێدا ئەنجام دەدرێت.
٣. نیوەی بازرگانی نەوتی جیهانی پێدا دەگوزەرێت ( لە ساڵی ٢٠٠٢ز پتر لە ١١ ملیۆن بەرمیل بووە لە ڕۆژێکدا ) کە بەردەوام لە پەرەسەندن دایە بەهۆی گەشەکردنی ئابووری چین.


الهند
تايلاند
فيتنام
ميانمار
(بورما)
سريلانكا
كمبوديا
مضيق ملقا
غينيا الجديدة
بورنيو
سومطرة
المحيط
الهندي
جاوا
أستراليا


مضيق الدردنيل
مضيق البوسفور
مضيق جبل طارق
قناة السويس
مضيق هرمز
مضيق باب المندب
مضيق ملقا

# هەڵبژاردنەکانی بەشی حەوتەم/ بازرگانی وگواستنەوە

١. گرنگترین گەرووی نێودەوڵەتیەکە هەردوو قارەی ئەوروپا وئەفریقیا لێك جیا دەکاتەوە :
(هورمز – بێرنگ –تیران- جبل طارق).

٢. لە بەندەرە سەرەکیەکانی گەرووی بۆسفۆر : ( برێم –ملەی زێرین – حەیدەر پاشا – ئیزمیت).

٣. لە دوورگەکانی گەرووی هورمز.دوورگەی : ( برێم – سیبا – هینجام – کاسا).

٤. ئەو گەرووەی کەدەریای ناوەڕاست( ئیجە ) و دەریای مەڕمەڕە بەیەك دەگەیەنێ گەرووی :
(بۆسفۆر – دەردەنێل – مەلاقا – قلارانس).

٥. ئەو گەرووەی کە دەریای سوور بە کەنداوی عەدەن دەبەستێتەوە پێی دەوترێت گەرووی :
(هورمز– باب المندب – جبل طارق- بۆسفۆر).

٦. ئۆکەندی سوێس ئەم دوو رووبەرە ئاویە بەیەکەوە دەبەستێتەوە :
( دەریای سوورو ناوەڕاست – دەریای سوورو کەنداوی عەدەن –
کەنداوی عەرەب وکەنداوی عومان – دەریای ناوەڕاست وزەریای ئەتڵەسی).

٧. ئەو گەرووەیە کە دەریای مەڕمەڕە و دەریای رەش بەیەکەوە دەبەستێتەوە :
(باب المندب – بۆسفۆر – جبل طارق – دەردەنێل).

٨. ئەو دوو پیشەی تەواوکەری بەرهەم هێنانن بریتین لە هەردوو پیشەی :
(بازرگانی وگواستنەوە – پیشەسازی وکشتوکاڵ – کانزاکاری وبازرگانی – بازرگانی و پیشەسازی).

٩. پەیمانی کوچك کینارچی کە روسیای قەیسەری سەپاندی بەسەر سوڵتانی عوسمانی لەساڵی :
( ١٧٧٢ – ١٧٧٤ – ١٧٧٠ – ١٧٧٨) ز بوو.

١٠. زۆربەی دەوڵەتانی جیهان دەیانەوێ پارێزگاری لە رژێمی ئابووری تایبەتی و جودای خۆیان بکەن بە دانانی یاسای گومرگی قەدەغەکار ویاساکانی سەودا ومامەڵەنەکردنی بازرگانی وەك :
(رامیاری دەرگای داخراو – رامیاری بازرگانی ئازاد – سەپاندنی باج – بازاڕی ئازاد).

١١. ئەو بەندەرەیە کەدەکەوێتە بەری ئاسیا لەدەریای مەڕمەڕە : ( ئیزمیت – تیکیرداغ – حەیدەرپاشا – ئەستەنبوڵ).

١٢. لەرووی ئاوەدانیەوە کردنەوەی ئۆکەندی سوێس بووە هۆی دروستبوونی گەلێك شارو بنکەی ئاوەدانی گرنگ وەك:
(ئیسماعیلیە – پۆرسەعید – سوێس – هەموو وەڵامەکان راستن).

١٣. توانی سوود لە هێزی هەڵم وەربگرێت بۆ هەڵسوڕاندنی ئامێرەکان،زۆری نەبرد بۆ گواستنەوەی دەریایی و وشکانی بەکارهێنرا :
( فردیناند دیلسبس – ئۆگۆست لۆش – هێرمان فراش – جیمس وات).

١٤. ئەو گەرووەیە کەوا دوورگەی کیشم وکەناری ئێران لەیەك جیادەکاتەوە : (باب المندب – بۆسفۆر – قلارانس – هورمز).

١٥. ئەو گەرووەیە کە هەردوو کیشوەری ئاسیا و ئەفریقیا لێك جیادەکاتەوە : (هورمز- باب المندب – جبل طارق- بۆسفۆر).

١٦. ئەو گەرووەیە کە دەریای ناوەڕاست و زەریای ئەتڵەسی بەیەك دەگەیەنێ : ( هورمز – بێرنگ –تیران- جبل طارق).

١٧. ئەو زەریایە دوای دۆزینەوە جوگرافیەکان بووبەزەریایەکی ئاوەندی و گواستنەوەی دەریایی تیایدا چڕتربوو، بریتی بوو لەزەریای:
(ئەتڵەسی –هێمن –هیندی –بەستەڵەکی باکور).

١٨. نزیکەی ٢/١ ی دانیشتوانی جیهان جێگیرن لە :
(باکوری رۆژهەڵاتی ئاسیا –باکوری رۆژئاوای ئاسیا – باشوری رۆژئاوای ئاسیا – باشوری رۆژهەڵاتی ئاسیا).

١٩. گرنگترین پێشکەوتن لەبواری گواستنەوەدا لەسەدەی بیستەم بەکارهێنانی گواستنەوە بوو بە :
(کەشتی – شەمەندەفەر –بۆری – ئۆتۆمبیل).

٢٠. ئەو زەوییانەی کەبەکەڵکی کشتوکاڵ دێن تەنها :

( ٤٠٪ – ٥٠٪ – ٥٥٪ – ٦٠٪ ) ی ڕووبەری ووشکانی دەگرێتەوە ئەگەر ناوچە جەمسەریەکانیشی لێ دەربکەین.

٢١. ئەو گەرووەیە کەوا کەنداوی عەرەبی وکەنداوی عوممان بەیەك دەگەیەنێ : ( جبل طارق-باب المندب-تیران-هورمز ).

٢٢. ئەو دوورگەی کەوا گەرووی باب المندب دەکات بە دوو ڕێگا : ( تونبی بچووك –لارك – قشم – بریم ).

٢٣. کەنارەکانی باشوری گەرووی هورمزە وسەر بە وڵاتی عوممانە :

( سەری پارتل-سەری مەنهالی –سەری ترافلگار-سەری مسندم ).

٢٤. تەسکترین بەشی گەرووی جەبەل تاریق دەکەوێتە لای خۆرئاوای هەرێمی ئیسپانی سەبتە کەدەگاتە :

( ١٠ کم – ١١ کم – ١٢ کم – ١٣ کم ).

٢٥. چالاکی بازرگانی گێڕایەوە بۆ بەندەرەکانی دەریای ناوەراست دوای پەککەوتنیان پاش دۆزینەوەی رأس الرجاء الصالح :

( نۆکەندی سوێس – نۆکەندی پەنەما – نۆکەندی کێل – نۆکەندی ئینگلیزی ).

٢٦. بەکەنداوێکی بچووك دەژمێردرێت لە مۆلگەی ئەستنبوڵ کەدرێژیەکەی لە ٢ میل زیاتر نییە و پانییەکەی چارەگە میلێکە :

( سەری سیان – سەری سپارتڵ – سەری مسندم – ملەی زێرین ).

٢٧. بازرگانی راستەوخۆ بەستراوەتەوە بە :

( A- زێدە بەرهەم B- ئارەزووی بەکاربردن C- سیستەمە ئابووریەکان D- هەریەکە لە A و B راستە ).

٢٨. ئەو ئەندازیارە فەرەنسیە بوو کە خاوەنی بیرۆکەی هەڵکەندنی نۆکەندی سوێس بوو :

( فردیناند دیلسبس – هێرمان فراش –جیمس وات – فۆن تۆنن ).

٢٩. پێشان بەم گەرووە دەووترا ( دەرگەی فرمێسك ) : (( جبل طارق-باب المندب-تیران-هورمز ).

٣٠. لە بەندەرە سەرەکیەکانی گەرووی بۆسفۆر لە بەری ئەوروپا : ( ئەستەنبوڵ –تیکیرداغ– حەیدەر پاشا – ئیزمیت ).

٣١. جیاوازی دابەشبوونی دانیشتوان یەکێکە لە هۆکارەکانی پەیدابوونی :

( پیشەسازی – کشتوکاڵ – بازرگانی – پیشەی داربڕین ).

٣٢. گەرووی بۆسفۆر ئەم دوو دەریایە بەیەکەوە دەگەیەنێت :

( دەریای ناوەراست ودەریای رەش – دەریای ناوەراست و دەریای سوور

– دەریای مەڕمەڕە و دەریای رەش – دەریای مەڕمەڕە و دەریای ناوەراست ).

٣٣. سەری مسندم کەنارەکانی باشوری گەرووی هورمزە سەر بە وڵاتی : ( عومان – کوێت – ئێران – ئیمارات ).

٣٤. دەکەوێتە باکوری دەریای ڕەش، کە ڕوسیا توانی لەسەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەم دەستی بەسەردا بگرێت :

( نیمچە دورگەی قرم – دورگەی کیشم – نیمچەدورگەی کەمەشتکا – دورگەی ترینیداد ).

٣٥. ئەو گەرووەیە کەلەباکورەوە دەریای سوور لە باشورەوە زەریای هیندی ( دەریای عەرەب وکەنداوی عەدەن ) بەیەکەوە دەگەیەنێ:

( هورمز – باب المندب – قلارانس – کێل ).

٣٦. شۆرشی پیشەسازی لەئەوروپا سەری هەڵدا سالی : ( ١٧٦٠ – ١٧٧٠ – ١٧٨٠ – ١٧٩٠ ).

٣٧. ئەم دوورگەیە سەر بە وڵاتی ( یەمەن ) ە : ( خەرج – کیشم – تونبی بچوك – بریم ) .

٣٨. پرۆژەی هەڵکەندنی نۆکەندی سوێس کە ئەندازیاری فەرەنسی ( فردیناند دیلیسبس ) خاوەنی بیرۆکەی بوو ، جێبەجێکرا سالی :

( ١٨٦٩ – ١٧٦٩ – ١٦٨٩ – ١٨٩٦ ) ز.

تەواوبوو بە پشتیوانی خودا

ئاکۆ صابر عثمان – هەولێر / ٠٧٥٠٤٥٢٣٦٤٢